# پێشبینییەکانی

منتدى إقرأ الثقافي

# سەید ڕێناس گۆمەتالی

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

منتدى إقرأ الثقافي
للكتب ( كوردى - عربي - فارسي )
www.iqra.ahlamontada.com

دوا ڕۆژی
ئەمریکا، هیندستان، کۆریا،
تیبت، ئێران، ئێراق،
ئەندەنوسیا، فەلەستین،
کوردستان، قوبرس، هەولێر،
کەرکوک، گەردون...

ناوی کتێب: پێش بینیەکانی سەید ڕێناس گۆمەتاڵی
تایپ: هەڤاڵ قەلادزەیی
نۆرەی چاپ: یەکەم
شوێنی چاپ : چاپخانەی رۆژهەلاَت - هەولێر
تیراژ: ۱۰۰۰
نرخ: ۲۵۰۰
لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردن (۲٥۳٤) ساڵی ۲۰۰۹ ی پیَ دراوە

**پێشکەشە بە : -**

- گیانی باوک ودایکم
- ئەوانەی بۆ ساتێکیش بیَ کە دڵیان لێم زویربووە
- ئەوانەی کە سەودا سەری مەعریفەن
- نەشمیل وزارا
- ژیاوە ، بوژین ، هەرژین ، لۆژین ، هەمو مندالأنی وولاَتەکەم
- پێشکەشە بە تۆش ئەی خوێنەری بەڕێزم .

## (( پێش دەست ))

خوشك وبرای خوێنەر ، هەرچی کەسێکی تۆ ئادەمیزادی ، زانای ، نەزانی ، خوێنەر یان نوسەر ، سەرکردەی یان عەسکەر ، گرنگ ئەوە ، بیربکەوە ، دامەمێنە ، ڕامێنە ، ڕەخنە مەگرە له هەڵبەستم وا مەزانە کە هۆنەرم ، لەسەرە خۆو ووردە ووردە پێویست بەپەلەپەل ناکا بیخوێنەوە نەرم نەرم ، هیچت لەسەر تێپەڕنەبێ ، مەبەستم له ووشەکانە هەرپێت پەخشانی تەڕ نەبێ ، واش مەزانە هەڵبەستێکی بێ مانایە ، وورد سەیری کە من پێم وا یە ، شتی بە سودی تیا یە ، وامەزانە زۆر بێ ئەقڵ تر لە کەرم ، بیخوێنەوە نەرم نەرم ، ئەو وێنەی وا لەناو سەرم مەڵی زۆر زاراوەی تیا یە ، ئەوە شیان بە کەڵك نا یە چونکە هەموو زاراوەکان زمانی خۆمانن ، ئەوانەی جیاوازی پێ دەکەن یەکەمیان دوژمنە دووەمیان نەزانن سەبارەت بە ووشەی بیانی کە هەبوو ،ناوەڕۆکی بابەتەکە ناگۆڕی وانەبوو گرنگ ئەوە یە پێکەوە هەمووومان ، خزمەت کەین هەوڵ دەین بۆ بەرزی نیشتمان چی دەبێ خزمەت کەین بە خەڵکی جیهانیش ، مرۆڤن ، ئادەمیین ، هەرچینە ، ئەوانیش .

# پێشەکی

ئـەی خوێنــەری خۆشەویـست ،لەوپەرتوکـە هـەر چـیت خوێنــدەوە ،چیت زانی ،چیت بیست ، ئەگەر ویستت یان نەتویـست ، هـەموویان یـــەك لـــەدوای یـــەكتر دێـــن ، گـــرنگ نیـــە شـــوێن ،یـــا شـــوێنی ڕوداولەكامەجێن ،چاوم یەك یەك بینو یەتی ،بۆیە پێنوسە شڕەكەم لـەو پەرتوکـە نوسـیویەتی ،چـەندم لێـرە داڕشـتوە ،لەمێـشك ودڵ ودەرونم سەدان هێندە چین لەسـەر چین وا نیـشتوە . پێـت وانـەبێ هەر كاتی خۆم پێ كوشتوە ،خودا یاربێ ، ئەگەر حاڵم وەكـو پـاربێ ، ئەوانیش گشت دا دەڕێـژم تـەنیا ژورێكـم هـەواربێ ، ئـەوانیش هـەر دادەڕێژم ئەوەی زانیم یان دەیزانم یـان ئـەوەی ئێـستا زانیومـە هـەر دەبێژم ، ماندو بوونم ، یان لەناو مێشك ڕۆچونم ، یاخود هـەر شـتێ دەیزانم ، هەر هەموو بیرو بۆ چـونم ، بـۆ ئێوەیـە ، چۆن ئـەوەم بـۆ تۆماركردون ئەوانیش هەر تۆماردەكـەم بـەم شێوەیە ، زۆری تـریش بەڕێوە یە ،چ گرگان چ كرێـوە یـە ، شـوان چۆن خۆشـی دەوێ پـەز ، مـــام ڕەزەوان هـــۆگری ڕەز ،منـــیش خـــوای خـــۆم و تـــەنیاییم واخـۆش ئـــەوێ گـــەر بتـــەوێ ، یـــا ڕێـــت كـــەوێ ،چـــاوت بـــەمنی بـــچوك كـــەوێ ،ئـــەوەت نـــەوێ ،لـــە بـــۆ خـــۆت دروســـت كـــە

جـەوێ وابزانــە مـن وا لـەوێم ، یـان ئێـستا دێـم ،گـەر بکـرێ پـێم ،پرسـیارەکان لـەخۆت بکـە ، خـۆت سـەیری نـان و دۆت بکە،سـەیری خۆت وسەیری ژیان ، وورد بەوە لەم قسەم جوان سەیرکە نـاو ئەو پەرتوکە ،قسەی کەسێکی بچوکە ، بـچوك بـچوك یـەکجار وردە ، ئاگاداری ؟ بۆ تۆمە ئەم بـردە بـردە ، ئەگـەر ویـستت مـن ببینـی بـۆ پرسیارێ یاخود بـۆ پـێ ڕابـواردن و بەقەسـدی بـونی ئیخبـارێ ، واز لەم ویـستەی خـۆت بهێنـە ، هەنـدێ سـەرت بلەقێنـە ، خـۆت بناسـە وهانا بۆ خوێندوە بێنە ، ئەگـەر نێـرن ئەگـەر مێنـە ،دڵ و دەرونـت بکەوەو لەوشەکان ڕابمێنە ،چ شو ێن چۆڵە ئـەمن لـەوێم ، تـۆ بـۆلام مێ من بە ووشە بۆلای تـۆ د ێـم ،چـونکە د یـار نـی یـە ڕێ وجـێم ، ماندومە بەلـە خوێنـدەوە پـەڕەکان یـەك یـەك هەڵدەوە ، تابنـەوە ، تۆش لەناو بیران دا ڕاچوو لەنێو ووشەو پەڕەکانـدا وەرە وبـچو ،گـەر موچرکت بەلەش داهات سات لە دوای سات ، ئـەوە بزانـە لێ ی حـاڵی ،مامۆستای ،دکتۆری حەماڵی ،بەقاڵی ،پیری ، جەوانـی ،تەمەن چـەند ساڵی ، ئەوە بزانە نزیکی کەماڵی ، مرۆڤیش نزیك کە ماڵ بێ باشە، کـەماڵی تـەواو هەرخوایـە عیرفـانی ئـەو لـەبن نایـە ، دەریایـە ،ئـەو لەهـەمو کـەون دایـە ،ئـەوەی لـەدڵ ودەرونم ، لـەبیروفکروبۆ چونم ،ئەکەم بەپردێ پێیدابڕۆن ، دنیا بۆتە کەلاوەی کۆن ،باوەڕ نەکەن بە

دۆنادۆن* کەموکوڕی کەم تێدایە ئەوکتێبەی لەبەردەستتە ئەوەی لەو پەرتوکەدایە نەوەك ئەوەی مەبەستتە ، ئەوەی نوسیم هەموو یەك یەك دەبێ ببێ مەڵێ شێتە ، خەریکەو بەتەمای بیڵێی چاوم لێتە ، ڕێناس چرای دەستی تۆیە شەوێ وێتە ، هێندە خۆی بچوك دەزانێ ئەو تۆزەیە لەبەرپێتە ، ئەوانەی منیان خۆش ناوێ من پتر نۆکەری ئەوانم ،چی پیاوەتیە برای خۆم خۆش بوێت ، خەڵکیش هیچ ، نازانم ، هەموو یەکترو خۆش بوێ دنیا هەرپێنجو دوو ڕۆژە ، دەبێ بۆخۆشترم بوێن (ژیاوە و هەرژین ، بۆژە ولۆژە* ) ئەوەی لەو پەرتوکە نوسرا ، ڕۆییو کرا ، ڕابردوەو بەچاوبینرا ، تۆمارکرا ، لە تاریکی بۆئێوە دەبن بە چرا ،گەر ئێوەش تەمەن ڕێی نەدان ، یاخود هەریەك مان لەسەدان ، هەرباشە پەرتوکم بۆی دەبێتە ماشە ، پێی بگرن پشکۆ ، با دەستو پەنجەو نەسوتێ چونکە ناخۆشە بۆنی سۆ ، بیخوێنەوە ناهێنی نسکۆ ، هەندێکی تر لە هەڵبەستم ، یان لەڕازو لەمەبەستم ، لەو پەرتوکە بچوکە کە وەك خۆم شڕە ، لەپێشینی پڕە ، هەزاران ساڵی دەوێ ، خۆڕادەگرن تا ئەوکاتە لەمنو کەوێ ؟ ، ئەو پێشبینیانە کەمێك ، کەدێنە جێ لەسەر دەمێك ، هەندێکیان دەبینن ئێوە ، کەچۆن تڕێ بەری مێوە ، چۆن سێو لە باخەڵی سێوە ، دڵنیام تەمەن ڕێگە و

دەدا ، دەبینن ئەوەی دەبێ پەیدا ، دەبینی ، هەندێ پێشبینی چ کاکەمی چ زینی ، ئەوەی تریشی نەوەتان ، کە ئاوا بوو ڕەو ڕەوەتان ، ئێو نەوبینین ئەوەتان ، دێنە ژیان ، بەقازانج بێ یا بەزیان ، بەپێکەنین یا بەگریان ، ئەوانیش دەبینن هەندێ ، ئەوانیش یا ڕێز لەنوسینم دەگرن یا توڕی دەدەنە کەندێ یا سوپاسم دەکا شێتێ یا ئاقڵمەندێ منیش لەبەر هەندێ ، ئەوەو بۆ دەکەم باس ، باش گوێ بگرن خوشكو برای خاس ، پێویستم نیە بەپیا هەڵدانو بەسوپاس ، مامت ڕێناس نایەوێ ستایشو ڕێز،پێی خۆشە ژیانی دوورەپەرێز بۆفکران بچێتە مەتەرێز ،دانیشتنی سەر بەردانی پێ باشترە لە کورسی ومێز ،ناکەم چاوەڕێ ی پاداشێ ، نامەوێ چەپڵەو شاباشێ ، تۆپێت وا یە ئەوە ناشێ ، ئەوەی نوسیم هەر خزمەتە ، بۆ ئەو خاکەی وەك جەنەتە ، هەموو دنیاش ئینگلیزوچینی ، سود لەپێشبینیم دەبینی ، ئەو پێشبینیانەم دەرمانن ، هەتوانی زامی جیهانن ، چونکە گەردون برینداره ، زەوی لەبەر بەئازارە چارە نابێتن بەپارە ، هەریەکە و بەئەقڵی خۆمان

---

★ دۆنادۆن : تناسخ الارواح : گوا یە ڕۆح چەندان لاشە دەکات . وا تە دوای مردنی کەسێك دەچێتە جەستەی کەسێکی تر .

★ ژ یاوە ، بۆژین ، هەرژین ، لۆژین / هەرچوار منداڵی نوسەرن

بۆی دەدۆزینـەوە چارە ، لێـرە کۆتـایی پـێ دێـنم ، بـۆ خـۆم دەچـم ڕادەمێـنم ، ڕادەمێـنم لـە دنیـا یـێ لـەو دنیایـەی کۆتـایی نایـێ ، وا دەچمە چیا هەلوەدا بابزانم چی ڕو دەدا ، هەر بیر دەکەم ڕادەمێـنم ، فکران دەبەم ، فکـران دێـنم ، جار وا یـە سـێ ڕۆژ پـێ دەچـێ ، بـۆ خۆشـم نـازانم شوێنم ، بـە ژانـە سـەر دەبم بێـدار ، دەبیـنم وێنـەی بەئازار ، هەموی تۆمارکراوە بە چوارین و هەڵبەست ، لە پێشەکی و پێـشدەست حـاڵی بـووی لەمەبەسـت؟ ئەگـەر حـاڵی ، ئـەوا نزیکـی کەماڵی ، ئینجا دەبا بێین وبزانین خەڵك چی دەڵێ ، بەشێتم دەزانن یان ئاقڵ ، وەڵام چی دەبێ نەخێر ، یا بە ڵێ .

سەید ڕێناس

پا یزی ٢٠٠٩

## (( من و خەڵك ))

خــە ڵــك پــێ یــان وا یــە شــێتم
گوێــت لــێ بــێ تــۆزی بــەر پێــتم
مـــرۆی لـــە تـــاریکی ون بـــوو
بـــۆ تـــاریکی چـــرای ڕ ێـــتم

★ ★ ★

خزمـــەت کـــاری دنیـــا و تۆمـــە
شـــەرم لەگـــەڵ مێـــشکی خۆمـــە
ئـــەو وێنـــەی دێتـــە بەرچـــاوم
وەك ڕونـــاکی گـــڕی مۆمـــە

★ ★ ★

ئێـــستا کـــەپێم پێـــدە کـــەنی
قـــا قـــا لێـــدە ، لـــەخۆت خـــەنی
بـــــەڵام ڕۆژی دا دێ کاکـــــە
پێـــــشبینم دنیـــــا دە تـــــەنی

چــونکه ئــەوەی مــن ووتومــە
یــاخود بۆهــەر بــیرێ چــوومە
ڕاســـت دەرچــووەو هاتۆتـــەجێ
چ ڕۆژێ خۆشـــە یـــا شـــوومە

★ ★ ★

ئـــەوەی ووتم ڕاســـت دەرچـــووە
زۆر کەســـیش ئاگـــای لـــێ بـــووە
شـــاهیدی زینـــــدووم زۆر زۆرن
زۆرن نـــــە هەریـــــەك و دووە

★ ★ ★

ڕە نگــە لــێم دەن تــوانج وتانــە
هـــەتا ڕێنـــاس لەگەڵتانــــە
کــە مــرد ئنجــا قــەدری دەگــرن
ئـــەوە سروشـــــتی ژیانــــە

# ئەو پێشبینیانەی لە سەید ڕێناسم بینی

بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٩٩٧ سەید ڕ ێنا سم ناسی کە ئەو کاتە مـن بەڕێوبەری ئاسا یشی هەولێر ـ ئیـدارەی سلێمانی بـووم ، نـاوبراو لەگەڵ خۆم لە ئاسا یش بوو ، بیرو بۆ چونی ووردی هـەبوو .. مـن لـەژیانی سیاسـی و سـەربازیمدا زۆر کەسـم بینیـوە وەکـو لێکۆڵـەر لەبواری سیاسەت ، لێکدانەوەی بارودۆخیـان کـردوە و بارودۆخیـان هەڵسەنگا ندوە ، ئەویش بەبوونی چەندین ئەگـەر وا تـە بـیرو بـۆ چونەکانیان ئەگەری تیا بووە . بەڵام ئەوەی لەسەید ڕ ێناسم بینـی شتێکی ترە دەتوانم بڵێم پێشبینی یەکی تەواو بووە بێ بونی هـیچ ئەگـەر یـك لەسـاڵی (١٩٩٨ ) بـە نوسـین ڕونکردنەوەیـەکی دامـێ کەلەسەرەوەی نوسرا بوو (بابەت / پێشبینی) ، ناوەڕۆکی نوسراوەکە ئـەوە بـوو ( مـن سـوپای ئـەمریکی وا لـە هەڵەبجـەو دەوروبـەری دەبیـنم ، دەبیـنم واچـۆن خودەیـان لەسـەرەو کۆڵەپـشتیان بەپـشتەوەیەو چـەکدارن ) نوسـیبووی وادەبیـنم ووشـەی وادەبیـنم لێکدانەوەی بارودۆخ نی یە ، بـەڵکو شـتێکی تـرەو دەرەتـان بـۆ هـیچ ئەگـــەرێك ناهێڵێتـــەوە وە لـــەناو نووســـینەکەیدا هـــاتبوو ( ئـــەمریکا ڕژێمـــی صـــدام دەڕوخێنـــێ بـــەڵام لـــە

پێشدا وا سوپای ئـەمریکی لەهەڵەبجـەو دەوروبـەری ئـەبینم ، وا تـە پێش ئەوەی گورز لەڕژێمی صدام بووە شێنن دێنە سنوری هەڵەبجـە بەلام نازانم هۆی هاتنیان بۆ هەڵەبجە و دەوروبەری چی یـە ) پـێش ئـەو پێـشبینی یـەی زۆر جاری تـر پێـشبینی شـتی دەكـردو ڕاسـت دەردەچوون بەش بەحاڵی خۆم لەپێشبینی یەكانی دڵنیا بـووم ، بـە لام سەبارەت بە ها تنی سوپای ئـەمریكا بـۆ هەڵەبجـە و دەوروبـەری شتێك بوو لە مەزەنـدە بـەدوور بـوو ، بۆیـە بـە سـەید ڕێناسـم ووت هەموو پێشبینی یەكانت ڕاسـت دەرچـو بـن ، ئـەوەت وا نابـێ وە تـە نانەت پێم گوت تۆ شێت بووی ، كەچی دوای (٥) ساڵ ئەو پێـشبینی یە ی ڕێك وەكو خۆی هاتە جێ ، بـە ڕاسـتی ئـەوە هـەر شـتێكی ئـاوا ئاسا یی نیە،وە جگە لەوەمن شاهیدی ئەوەشم كاتێ بەڕێز (عبداللـە ئۆجـەلان) دەسـتگیركرا زۆركـەس دەیگـوت لەسـێدارەی دەدەن بـەلام دیــسان ســەید ڕێنــاس نوســیبوی ( وا دەبیــنم بــەڕێز ئۆجــەلان لەسـێدارە نادرێـت و pkk ش دەچـێتە نـاو پەرلـەمانی توركیـا )

ئەو شتانەی کەباسم کردن شتی هەر ئاوا ئاسایی نین ، ئێستاش پێشبینی یەکانی کەلە دووتوێی ئەم پەرتوکەدا تۆمار کردوە بەڕاستی جێگای دەستخۆشیە ومن دەستی ماندوبونی ئەگوشم دڵنیام پاشەڕۆژێکی گەشی دەبێت هەرچەندە ئەوەندەی من بیناسم کاری  بە پاشەڕۆژ نی یە بەلاّم ئەوەی گرنگە من پێم وا یە ئیتر سەید ڕێناس هەر کەسی منداڵ وخانەوادەی خۆی نیە ، بەڵکو کەسی هەمووانە ومولکی ئەو وولاّت ومیللەتەیە بەڕاستیش شانازیە بۆ کورد وکوردوستان کە ڕۆڵە یەکی وای هەبێت کەپێشبینی بۆ کوردستان و جیهان بکات ، دڵنیام سودی بۆ هەمو جیهانە وما یەی سەر فرازیشە بۆ کوردستان .

لیوا / محسن عوسمان حمد

سلێمانی / ٢٠٠٩

## (( ئەوەی من بینیم ))

ئێوارەیەکی ساڵی ١٩٨٩بوو کە بەمیوانی لەماڵی کاك ( سیامند محمد تاهیر) ی ناسراو بە (وەستا سیامەند ) بووم لەگوندی باتاس لەو کاتەدا دیاربوو کوڕە گەنجێکیش میوانی بوو ، لە ماڵی ناو برابوو ، لە دوای ئەوەی لە من دڵنیا بوو دەستی بە ووتوێژ کرد لەگەڵ وەستا سیامەند لەبارەی ئەوەی چۆن دەربازی بکات بەرەو کوردستانی تورکیا ، د یاربوو مەبەستی ئەوەبوو بگاتە ئەوروپا ،چونکە ئەو گەنجە د یار بوو پێشتر پێشمەرگە بووە و دایك و باوکی وخوشکەکانی گیرابون لە دائیرەی ئەمن لەسەر خۆیی وبرا یەکی کەپێشمەرگە بونە دواتر تەسلیم ببۆوە ، ئەوە بوو من ئەو ئێواردیە ( سەید ڕێناس ) م ناسی ، من و وەستا سیامەند قسەمان لەگەڵ کرد کە نەچێتە دەرەوە و لەکوردستان بمێنێتەوە ، کەچی سەید ڕێناس زۆر بە دڵنیایی وە دەیگوت تاکو نزیکەی (٣) ساڵی تر هیچ ئاسۆیەك بۆ کوردو کوردستان نابینم ، وەك ئەوەی فلیمێکی لە پێش چاودا پەخش بکرێت ، هەر چۆنێکی بێ من و وەستا سیامەند ئەو ئێوارەیە قسەمان لەگەڵ کردو بۆ بەیانیش (سەید ئەنوەر ) ی برای هات لەهەولێرەوە ئیتر قەناعەتمان پێ کرد کە بمێنێتەوە ئەوە بوو هاتە لای من و ووتمان تا خودای گەورە

دەرگا یەك دەكاتەوە ، ڕۆژی دواتر چوینەوە گوندی ( بەرازان* ) سەید ڕێناس ئەو كاتە تەمەنی نزیكەی ١٩ ساڵ دەبوو بەلاّم ئەقلێكی گەورەی هەبوو هەمو خەڵكی دێ یەكە خۆشیان دەویست ئەوەی وەكو ئەمانەت لەلای منن ولەبیرم ماون سەبارەت بە پێشبینی یەكانی ئەمانەن ،كەیەكەم جار بینیم ووتی : هیچ ئاسۆیەك نابینم بۆ كورد و كوردستان تا نزیكەی (٣) ساڵی تر لەڕاپەڕینەكەی ساڵی ١٩٩١ ئەوە وەكو خۆی دەركەوت ،وەلەگوندی (بەرازان) جارێكی تر كەساڵی ١٩٩٠بوو شیعرێكی خۆشی نوسیبو لەسەر ئەو (سەربازگە ) معسكرا تانەی دەشتی هەریر كە ڕە بایەیان لەناو زۆربەی زەوی یەكانی دەشتی هەریر هەبوون سەید ڕێناس لەشیعرێكەی دا ڕەبایەكانی شوبهاند بو بە ( لو ) واتە (دومەڵ) لە شیعرەكەی دا دەیگوت : هاكا بینیتان ئەو ( دومەڵ ) انە دەربوون منیش پێم گوت ئەوە مانای چی یە ؟ ووتی ئەم سەربازگەو ڕەبایانە نامێنێ و وا ئەو سەربازگانە دەبینم لێرە باردەكەن و ئێرە جێ دەهێڵن و

* بەرازان : گوندێكە دەكەوێتە دەشتی هەریر .

دەچـنەوە شـوێنی خۆیـان و وولاتـی خۆیـان ، ئـەوا لەکاتێکـدا هێـزی پێـشمەرگەی کوردسـتان نـەمابوو ،سـەید ڕێنـاس لەهـەمو ڕویێکـەوە مرۆڤێکی نمونەیی بوو نزیکەی دووسـاڵ لـەماڵی مـن بـوو وا هەسـتم دەکرد کەبرایەکی ڕاستەقینەی خۆمە ، ئەو ماوەیەی لەلای مـن بـوو زۆربەی جارخەریکی بیرکردنەوە بوو حـەزی بە تـەنیا یـی دەکـرد ، جـاری واش هـەبوو پـیّ ی دەوتم حـەزم لـە هـەولێرە منـیش پـێم دەگوت تۆ هیچ پێناس و بەلگەیەکت پیّ نیە لە (سـەیتەرە ) نـەوەك بتگرن ئەو دەیگوت وا دە بینم هیچ سەیتەرەیەکی ئەو ڕێگایە داوای پێناسم لیّ ناکەن من ئەوە م پیّ زۆر شـتێکی سـەیر بـوو ، زیـاتر لـە (١٠ ) جار ئێمە بە سەیارەی خۆم لـە بەرازانـەوە دەچوینە هـەولێر تەنانەت جارێکیش داوای پێناسەیان لیّ نەکرد ، بە ڕاستی من ئەوە بە ڕێکەوت نازانم چونکە ڕێکەوت هەرگیز هێندە دووبارە نابێتەوە ، ئەوانەی کەخۆم لـێم بینیـوە ئەوانـە بـوون ، ئێـستاش کـە کۆمەڵـە پێشبینی یەکی لەم پەرتوکە دا تۆمارکردووە و ڕامانی زیاتری هەیـە لەجاران بەڕاستی مایـەی دەستخۆشـیە ، کـە لـەم پەرتوکـە هـەمووی

بە هەڵبەست تۆمارکردودو پێشەکیەکی یەکجار بە پێزی بۆ نوسیوە کە مرۆڤ هەر حەز دەکا بیخوێنێتەوە ، سەید ڕێناس مایەی شانازیە بۆ وولاتەکەمان .

سليم اسعد سليم ا غا

٢٠٠٩

## ( ڕێناس ) م لە منداڵیەوە بەم جۆرە بینی

ڕێناس لـە منداڵیـەوە لەمنداڵە هاوتەمەنـەکانی خـۆی ووریـاتر بـوو لەبەرئەوەی برای بچوکم بـوو هەمیـشە بـۆ هـەموو شـوێنێك لەگـەڵ خۆم دەبرد لەبیرمە هەمو جارێك ئەگەر لەگەڵ بـرادەرە گەنجـەکانم دەچوینە پیاسەکردن . یان بازاڕ یان گەشت وگـوزار بـرادەرەکـانم پـێ یان خۆش نەبوو لەگـەڵم بێت ، بـەڵام ڕێنـاس بـە دوا مـان دەکـەوت دەیـووت هـەردەبێ لەگـەڵ خۆتـان بمبـەن حـەزم لەگەڕانـە سـەرەتا برادەرانم پێ یان ناخۆش بوو بەڵام چونکە من حەزم لەوە بوو کە لەگـەڵم دابـێ ئـەوانیش چـاو پۆشـیان لـێ دەکـرد ، جـاری وا هـەبوو برادەرانم هێندە یان پارە دەدایێ کە زیاتر بوو لە ڕۆژانەی مـانگێکی بـەڵام ڕێنـاس پارەکـەی تـوڕ دەدا یـە نـاو ئـاو وچـلکاو و بـە دوامـان دەکـەوت ، زانیومـە منـداڵ ئەگـەر پـارەت دا یـێ دەسـتی لەهەنـدێ ئارەزووەکـانی بـەر دەبـێ ، بـەڵام ئـەو پـارە کـاری تـێ نـەدەکرد و لەگـەڵمان دەهـات ، ڕێنـاس بەتەمـەنێکی بـچوکەوە زۆر جـار درکـی بەشت دەکرد ، زیـاتر لـە دە یـان جار کـە بەیەکـەوە دەچـوینە ماڵـە خزمێك ،

یان لە بازاڕ دەگەڕاینەوە ماڵی خۆمان ئەو دەیوت وەڵڵا دەرگا قفڵ دراوە ئەو ماڵە خزمە لەماڵ نین یان دەرگای ماڵی خۆمان داخراوە کەسمان لەماڵ نیە کەددچوین ڕێك وابوو ، بەو ڕامانە وردەی زیاتر لەلام خۆشەویست دەبوو . ساڵان هاتن وچون من بووم بە پێشمەرگە لەدەشتی هەولێر بووم دواتر کە مفاوەزاتەکەی ساڵی (١٩٨٤) کرا ئەو کاتە بارەگامان هاتە گوندی (کەردز) ی سەر بە ناحیەی (قوشتەپە) ڕێناس دەهاتەلام کەئەو کاتە پۆلی دووی ناوەندی بوو دەیگوت دەبێ بمکەن بە پێشمەرگە . منیش پێم دەگوت تۆ بخوێنە من ناوم نوسیوی بۆت بە پێشمەرگایەتی حیساب دەکەم ، د یاربوو زانی بووی من نامەوێ ببێتە پێشمەرگە ئەوە بوو هەر لەو ساڵەدا چوبو بۆ گوندی (علیاوە ) ی سەر بە ناحیەی (دێگەڵە ) ماڵی باپیرم لەوێ بوو لەوێ پێشمەرگەی دیبوو خۆی لەشانەی شەهید کارزانی سەر بە کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە ڕێکخستبوو دواتر کە مفاوەزاتەکە تێکچوو ڕێناس تازە دەرچوو بو بۆ پۆلی سێ ی ناوەندی بەڵام نەیخوێندو بووە پێشمەرگە لەساڵی (١٩٨٥) کە ئەوکاتە تەمەنی تەنها (١٥) ساڵ بوو ، پێشبینی یەکی سەیرم لێ دیت لەساڵی (١٩٨٧) کە ئەو کاتە بارەگامان لەگوندی

نـازەنین بـوو ، ووتـی وا دەبیـنم ڕژێمـی بـەعس لـەو شـوێنانە دەرمانـدەکات و کوردسـتان و شاخەکانیـشی بەدەسـت پێـشمەرگە وە نـامێنی وە ووتـی وەرە بـابڕۆین بـۆ ئـەوروپا چـونکە جـارێ هـیچ ئاسۆیەك بۆ کوردستان نابینم . وە ددبینم بارەگای سوپای عـیراق و سەربازگەکانیان دێنە ئـەو شـوێنانەی کـەوا ئێـستا بارەگـای ئێمـەن . منیش لە بەر ئەوەی لـەو گـەورەتر بـووم پـێم گـوت ڕێنـاس مرۆڤـ نابێـت لـە ترسـی واقیعـی گەلەکـەی خـۆی ڕابکـات بـۆ هەنـدران ئـەو ووتی ڕاستت کرد بۆیە بیری ڕۆیشتن لەمێشکی دەرچـو بـەڵام لەبـەر ئەوەی دەیگوت ئەو ناوچانە دەبینم لەدەستی ئێمە نەماوە ئیتر بێ هیـوا یـی وای لێکردبـوو هەڤاڵـەکانی پـێ یـان دەگـوت ڕێنـاس تـۆ ڕوخـاوی ئـەو دەیگوت نـەڕوخاوم خـۆمن هێـشتا موالیـدی عـسکریم نـەهاتووە ئـەوە دوو ساڵیـشە پێـشمەرگەمە بـەڵام مـن وێنەیـەکی ناخۆش دەبینم لەبەر ئەوە بێ تاقەتم ئەو کاتـەش هەمیـشە حـەزی لەگەڕان بوو بە تەنیا دەچووە چیای ئاوەگرد تا ئێوارە نەدەهاتەوە ، دوای ساڵ ونیوێك لەم پێشبینی یەی ئەوە بوو شەڕی ئێران ـ عێراق لەمانگی ٨ ی ساڵی ١٩٨٨ڕا وەستا ڕێناس ووتی ئەمجار خـۆت حازرکـە بۆ پێشبینی یەکـەم ، ئـەوە بـوو ڕژێمـی بـەعس هێرشـی کـردە سـەر ناوچە ئازادکراوەکان و دواتر داستانی شەڕی (جوانەگا ) تۆمارکرا ،

ئـیتر دوای ئـەو شـەڕانە هێـزی پێـشمەرگە بـەرەو ئێـران هەڵکشی و ڕێناس لەگەڵ مفرەزەی (ئازاد باوەقوبی ) و شەهید (خـسرەو شـیرە) بە پارتیزانی گەڕانەوە بۆ دۆڵی سماقولی و دەشـتی هـەولێر ، دواتـر کە ماڵەوەمان باوك ودایـك وخوشـکەکانم لەلایـەن دائـیرەی ئەمنـەوە گیران دەرەتانێك نەماوە ڕێناس بەناچاری تەسلیم بۆوە ودمنیش لـە ئێرانـەوە هاتمـەوە و تـەسلیم بومـەوە . ئـەوەی زیـاتر منـی سەرسـام کـردوە سـەبارەت بـەڕیناس هـەر لـە منداڵیـەوە تـاکو ئێـستا تـەنها ڕۆژێکیش بۆ پارە پەیداکردن ماندوونەبووە وە پارە لەلای ئەو هـیچ گرنگیـەکی نـەبووە وە لەگـەڵ ئەوەشـدا هەمیـشە حـەزی لەنوکتـە و قسەی خـۆش وپێکـەنین بـووە . زۆر کـەم یـان نەمـدیوە جارێـك دڵ تونـدی پێـوە د یاربوبـێ . نـازانم کەسـێك ئەگـەر خـەم نـەخوا چۆن دەتوانێ هێندە ڕابمێنی وبیر بکاتـەوە ئەگـەر وەڵامـی ئـەو پرسـیارەم هـەر لای خـۆی دەسـت کـەوێ . ئێـستاش کـەبینیم لەبازنەیـەکی فراوانترا لەجاران پێشبینی یەکانی لەم پەرتوکە تۆمـار کـردوە ،زۆر پـێ ی دڵخـۆش بـووم وە دڵنیـام کوردسـتان وجیهـانیش سـود لـە پێـشبینی یـەکانی دەبیـنن ، وەلـە خـودای گـەورە داواکـارم تەمـەنی درێـــژبێ و هـــەمو ســـود لەپێـــشبینی یـــەکانی ببیـــنین .

((**سید ئەنوەر - هەولێر**))

## (( منیش وام بینی ))

من لەساڵی ١٩٨٤ وە سەید ڕێناس دەناسم ، هەر لەو کاتەوە زیرەکی و ووریا یی پێوە دیاربوو ، هەرچەندە من لە ئەو گەورەترم بەڵام زۆر جار ئاگام لێ بووە لەو مەجلیسانەی کە ئەوی لێ بووە گوێ بۆ قسەکانی شل کراوە و ئەو بیروڕای خۆی دەربڕیوە و خەڵکەکەش بەچاوی مرۆڤێکی تەمەن گەورە سەیریان کردوە ، ئەو بە تەمەنێکی بچوکەوە بووە پێشمەرگە کە ئەو کاتە تەمەنی (١٥) ساڵ بوو ئیتر لەو کاتەوە نەمبینی یەوە تاکو ساڵی ١٩٨٩ کە ماڵەودیان دایك باوکی و خوشکەکانی لە دائیرەی ئەمن گیرابوون لەسەر ئەوو برایەکی تری بەناوی (سەید ئەنودر ) کەئەویش پێشمەرگە بوو وەساڵی ١٩٨٩ تەسلیم بۆوە ودواتر هاتە لای من بۆگوندی ( باتاس ) ئەوە بوو دەیویست بچێتە تورکیا و لەوێ وە بچێتە ئەوروپا ، منیش برادەرێکم لەکۆمەلگای (باسرمە ) هەبوو بە ناوی (کاوە بارزانی ) کە ئەو کاتە ئەو کرین و فرۆشتنی چەکی دەکرد و هات وچۆی کوردستانی تورکیای دەکرد ئەوە بوو ئێوارەکیان چوینە ماڵیان بە مەبەستی ئەوەی کە (سەید ڕێناس ) بگەیەنێتە

کوردستانی تورکیا چونکە سەید ڕێناس زانیاری ئەوەی هەبوو کەبرا دەرە کۆنە پێشمەرگەکانی لەکوردستانی ئێرانەوە چوبونە تورکیا ولەوێ خۆیان تەسلیم بە ( UN ) کردبوو ئەوانیش ناویان نوسیبون بەمەبەستی ئەوەی ڕەوانەی وولاتانی ڕۆژئاوا یان بکەن وەکو پەنابەر ، ئەو ئێوارە ڕێك نەکەوتین لەگەڵ کاك کاوە بارزانی . دواتر ئێوارەیەکیان کاك ( سلیم ) ی گوندی (بەرازان ) کە خزمی خۆمە هاتە ماڵی ئێمە بە میوانداری لەوێ چاوی بە سەید ڕێناس کەوت و کەگوێ ی لەقسەکانی بوو د یاربوو ئەویش پەرۆشی حاڵی سەید ڕێناسی بوو . بۆیە پێ ی گوت کاکە بۆچی دەچی بۆ هەنددران وەرە لەگەڵ من دەچینە گوندی (بەرازان ) گوندێکی لایدەیە وکەس نازانێ تۆ چیت . هەرچەندە ماڵی سیامەندیش وەکو ماڵی خۆت وا یە بەلام (باتاس ) بەکەلکی تۆ نایە ولە هەریر نزیکە . سەید ڕێناسیش ووتی کاکە من هیچ ڕوناکیەك و ئاسۆیەك بۆ کوردو کوردستان نابینم جارێ تاکو نزیکەی سێ ساڵی تر ئەو ماوەیەش ماوەیەکی درێژە بۆیە پێم خۆشە بڕۆم بۆ هەندەران بۆ بەیانیەکەی (سەید ئەنوەر )ی برای هات وپێ ی گوت برام مەڕۆ ئێمە تازە تەسلیم بوینەوە و ماڵەوەمان ئازادکراون

بادیسان ئەو دایك وباوکە پیرەو خوشـکەکانمان نەگرنـەوە ، ئـەوەبوو سـەید ڕێنـاس قەناعـەتی کـردو مایـەوە و دواتـر لەگـەڵ کـاك سـلیم چـووە گونـدی (بـەرازان ) ئـیتر زۆربـەی کـات بـە یەکـەوە خـەریکی کـاری دەغـڵ و دان چـاندن بـوین لەگونـدی نـاوبراو وە برادەرێکـی ترمان بەناوی (کاك بەکر ) ئالانەیی کە ئـەو کاتـە ئـەویش مـاڵی لـە گوندی بەرازان بوو زۆربەی کات بە یەکەوە بوین ، لە بیرمە لەساڵی (١٩٩٠ ) سـەید ڕێنـاس شـیعرێکی نوسـیبوو لەسـەر ڕەبـا یـەو سەربازگانەی دەشتی هەریر کـە شیعرێکی خـۆش بـوو تیایـدا باسـی نەمانی ئەو سەربازگانەی تیا بوو ، دواتـر دەیـووت دەبینـم وا ئـەو سەربازگانە لێرە بار دەکەن و دەچنەوە سنوری خۆیـان ، هـەمووومان خۆشمـان دەویـست زۆر بـەجوانی شـیعرەکانی خـۆی بـۆ دەخوێندینەوە شیعری جوان جوانی دەنوسـی ،زۆرم پـێ سـەیر بـوو هەموو جارێ لەگەڵ کاك سلیم کـە دەچـۆوە هـەولێر نـازانم چـۆن داوای هەویـەیان لـێ نـەدەکرد چـونکە تـاکو هـەولێر سـێ سـەیتەرە هـەبوو کـە دەتـووت سـەگی هـارن داوای پێناسـیان لـە خـەڵك دەکـرد ، ئـەو هـەموو جـارێ دەیـووت مـن دەبینـم

داوای هەویـەم لـێ ناکـەن  بـە ڕاسـتی مـن پـێم شـتێکی سـەیر بـوو ، ئێستاش زۆر دڵخۆشم کـە دەبیـنم سـەید ڕێنـاس پێشبینیـەکانی  لـەم پەرتوکە دا تۆمارکردوە دەستخۆشی لـێ دەکـەم وە دڵنیـام کـە سـودی دەبێت بۆ وولاّ تەکەمان وپێشبینی یەکانی خزمـەتێکی گـەورە دەبـن بە مرۆڤایەتی .

((سیامەند محمد طاهر ))

هەولێر – ٢٠٠٩

## (( وا گوێ بیستی سەید ڕێناس بووم ))

مـن لـە سـاڵی ۱۹۹۷ وە لەنزیکـەوە سـەید ڕێنـاس دەناسـم ، ئـەو بـوو فێری ئەوەی کردم کە پەرتوکم خۆش بوێ ، وای کرد کە بەرە بـەرە بخوێنمـــەوە و خـــۆم پـــەروەردە بکـــەم ، ســـەید ڕێنـــاس هـــەردەم بیرکردنەوەی ووردی هەبوو کەئەوم ناسی ئیتر بـووم بەکەسێکی تـر وهەمیشە هەوڵی ئەوەم ئەدا کـەخۆم ودەوروبـەرم بناسـم ، زۆر جـار سەردانم دەکرد وهەمیشە حەزم دەکرد گوێگری قسە و باسەکانی بم ، ئەوەی دەمەوێ لێرەدا بیخەمە ڕوو ئەوەیە لەساڵی (۱۹۹۹) سەردانم کرد کە ئەو کاتە ماڵی لە کۆیە بـوو قـسەوباسمان لەسـەر بـارودۆخی عیراق بوو ، ئەو زۆر بـە دڵنیـایی وە گـوتی دەبینـم تەمـەنی ڕژێمـی بەعس ناگاتە (٥) ساڵی تر ودەڕوخێ ، ئیتر لە پاشـدا ئـەو پێـشبینی یەی وەکو خۆی دەرچوو ، کە ئـەوە ڕویـدا بەڕاسـتی سەرسـام بـووم ، ئێـــستاش دەستخۆشـــی ئـــەوەی لـــێ دەکـــەم کـــە پێـــشبینی یـــەکانی تۆمـارکردوە لـەو پەرتوکـە دا ، سـەرفرازی یـە بـۆمن کـە( سـەید ڕێناس) هاوڕێمە .

( مەریوان کاکەمەم )

## (( منو عيرفان ))

دووســـــەد جـــار كردوومـــــە تۆبـــە
توخـــــوا ڕێنـــــاس لەســـــەر خۆبـــە
دە بـــــەر بـــدە يەخـــــەی عيرفـــان
بـــە لكـــو خـــۆش بــژی لـــە ژ يـــان
بــــــــەس بيركـــــــەودو ڕابمێنـــــــە
وا ز لـــــــە مەعريفــــــە بهێنـــــــە
ڕێگـــــای ژيانــــــت بگـــــرە بـــــەر
بۆچـــی تـــەی دەكـــەی دەشـــت ودەر
بەهـــــــەزاران جـــــار قـــــــەولم دا
بــــــۆم نـــــــەكرا زۆر هــــــەوڵم دا
دەمگــــــوت عيرفـــــان و تووريەكـــــە
نـــــارنجی ورەش وســـــوور يەكـــــە

چـــی بکـــــەم مێـــشکم دنـــــەم دەدا
بــــە چـــیا دەکــــەوم  هـــــەلوەدا
دە مـــــوێ بــــزانم ئـــــەمن چـــیم
چـیم بـۆ چـیمە ؟ بـۆ میمــە مـیم ؟
دەمـــوێ بـــزانم مـــن بـــۆ هـــەم ؟
بـــۆ وەلـــی نەگـــەیی بـــە شـــەم ؟
بـــــۆ ئـــــەو دنیایـــــە ئاوایـــــە؟
بـــۆ بـــووك ژێـــر دەســـتی زاوایـــە ؟
بـــۆ ؟ ئـــاو شـــل و بـــەردیش ڕەقـــە
بـــۆ چـــی وا تاڵـــە ئـــەو حەقـــە ؟
مێـــشکم بـــچوکە بـــــەس بـــلاو
تێـــشم مەگـــــەن خـــــەیاڵ پـــلاو
لـــــە ســـــەرم نـــــەنراوە کـــــلاو
ئـــــەوا بــــۆلات هـــــاتم ســـــلاو

## (( هاوڕێیان و ئامۆژگارییەکانیان ))

من لە سەردەمی منداڵیەوە سەید ڕێناس دەناسم ، تاکو پۆلی سێ ی ناوەندی بەیەکەوە بوین، ئەو پۆلی سێ ی ناوەندی تەواو نەکرد بەتەمەنێکی بچوکەوە بووە پێشمەرگە دواتر لەدوای ڕاپەڕینەکەی ساڵی (١٩٩١) وە یەکترمان بینی یەوە وە ئیتر لەیەکتر دانەبڕاوین ، سەید ڕێناس بیرو بۆچونی زۆر ووردی هەیە ، وەکو ئاشکرایە مرۆڤ لەوەیە هەریەکەو جۆرێك بیرکردنەوەی هەبێ یان هەر کۆمەڵ و گروپێك بیرو بۆچون و تێروانینێکیان هەیە بۆ ژیان و دەوروبەر ، بەڵام ئەوەی لە سەید ڕێناسم بینیوە شتێکی جیا بووە سەبارەت بە بۆچونە وردەکانی ئەو هەمیشە ڕامان و بیرکردنەوە ی هەیە وحەزی بە تەنیایی بووە ، پێم دەگوت تۆ چ لەزەت لەم جۆرە ژیانە دەکەی کە هەمیشە مێشکت ماندوە ، ئەو دەیگوت من ئیشم گەلێ زۆرە هەردەم شەڕم لەگەڵ مێشکی خۆمەو زۆر لە زە تیش لەوە دەبینم ، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە دڵی خۆش بوو ، هیچ تەنگو چەڵەمەیەك دڵی تەنگ نەدەکرد ،ئەو هیچ شەهادەیەکی

ئەکادیمی نی یە بەڵام من هەمو جار بیرم دەکردەوە بۆ دەبێ ئەم مرۆڤە ئاگای لەم هەمو شتەی دەوروبەری هەبێ .. پێم دەگوت باشە تۆ ئەو هەمو بیرکردنەوەو ڕامانەت هەیە بۆ چی دڵت هەمیشە وا خۆشە و نازانی خەم خواردن چی یە ؟ لە وەڵامدا دەیووت لەوە یە من گرفتی دەرونی لە جۆری (شادی ) م هەبێ ، پێم گوت ئەوە چی یە ووتی ئەوە گرفتێکی دەرونی یە کەمتر بڵاوە لە گرفتە دەرونی یەکانی تر ، نازانم ئەو بۆچی کاری بە ئەوە هەبوو گرفتی دەرونی چی یە ، پاش ماوەیەکی زۆر پەرتوکێکم خوێندەوە باسی ئەم جۆرە گرفتە دەرونیە ی تیابو سەبارەت بەوە قسەم لەگەڵ کردەوە پێ ی گوتم ئەوانەی ئەم جۆرە شتە یان نوسیوە لەوەیە وردبونەوەی جوانیان نەکردبێ چونکە لەوەیە ئەم (شادی ) یە بۆ هەندێ کەس بشێ بەڵام بۆ من ناشێ چونکە من هەرگیز بە تەمای ئەوەدنیم ببمە شتێك خوانە خواستە ، وە چاوەڕێ ی هیچ پاداشتێك لەکەس ناکەم ، تەنها حەزم لەوەیە کەبیر بکەمەوە ، زۆر جار ئامۆژگاریم کردوە وە ئاگاشم لەوە بووە هاوڕێ یانی تریشی ئامۆژگاریان کردوە کە واز لە بیرکردنەوە بهێنێ وخەریکی ژیانی ئاسایی خۆی

بێ وەك هەر مرۆڤێکی تر ، بەڵام ئەو هەر خەریکی ئەوە بووە ڕابمێنێ و بیر بکاتەوە ، ئێستاش کە ڕامانەکانی سەید ڕێناس ئەو پەرتوکەی لێ هاتە لە دایك بوون مایەی دەستخۆشیە و شانازی بەوە دەکەم کە هاوڕێ یەکی وا نزیکم ئەم جۆرە بەر هەمەی هەبێ کەلەوەیە سەدان ساڵ بێ کەس زاتی ئەوەی نەکردبێ بەم شێوەیە لەسەر پێشبینی کردن بەرهەمی وا بەرهەم بهێنێت ، بۆیە سەید ڕێناس بۆ هەموان مایەی شانازیە .

**با یۆ لۆجی /**

**مزەفەر بابە صالح**

## شەو نامێنێ

دنیا ئێستا ڕۆژ و شەوە
بەڕۆژ ڕاکە ، شەو بخەوە
یەکێ کورت ئەبێ یەکێ درێژ
هەر ئاوا کردو یە کاوێژ
ئەو کاوێژە وا نامێنێ
ئەمڕۆ جیا دەبێ لە دوێنێ
دەزانم حەز و لە خەوە
هەر ڕا کشێ و دوا بکەوە
خەریك بن بە خۆ ناسێنێ
تا لێو نەخوێنرێ یاسینێ
بەس خەریکی زێڕ و زیوبن
هەلوەدای بیری ڕزیوبن

بـــا بێینـــەوە سەرباســـی خـــۆ
ئـــەوەی مەرجـــە تێبگـــەی تـــۆ
باســـــەکەمان ڕۆژ و شـــــەو بـــــو
باســـی فەلـــەك باســـی جـــەو بـــو
ڕۆژێ دادێ نامێنـــــــــێ شـــــــەو
منیـــان پـــێ شـــێتە ئـــەم وئـــەو
ڕونـــــاك دەبـــــێ شـــــەو وەك ڕۆژێ
خـــەڵك لـــە گـــەرمان نـــا ســـۆژێ
خـــۆر چـــوار دەوری زەوی دەگـــرن
ڕاوەســــتن ، بـــە شـــێتم مـــەگرن
چـــــونکە لـــــە منداڵیمـــــەوە
لـــــە تەمـــــەن دە ســـــاڵیمەوە

هەرچـــی ووتومـــە ڕاســـت دەرچـــو
لا ی زۆر کـــەس ،بـــە زۆرەی کـــەر چـــو
لـــە هـــەر لایـــەو خـــۆرێ هەڵـــدێ
چـــرقەی گـــەرما لـــە جەنگـــەڵ دێ
ئێـــــستا تێگەیـــــشتی بـــــرا
لـــە شـــەویش هەڵناکـــەی چـــرا
گـــەر تەمـــەنم ڕێگـــەم بـــدا
بـــەمردن لێـــو نـــەبم جـــودا
درکـــم بەهەرچـــی شـــتێ کـــرد
کـــە وێنـــەم بینـــی دەســـت وبـــرد
لـــە مێـــشکمی دەهێنمـــــە دەر
دەیخەمـــە ســـەر پـــەڕەی دەفتـــەر
تـــا ئێـــوە ســـودێ ببیـــنن
گـــوڵ لـــە جـــێ ی درك بـــچینن

هەولێر / ٢٠٠٨

## (( کونی ئۆزۆن ))

ئێستا لەبەر تیشکی خۆرێك فیغانتانە
ئێستا سەنت ولیرە و درهەم ئیمانتانە
نازانن چۆن پینەی بکەن کونی ئۆزۆن
لەبەرامبەر ئەوکونانە دەست وئەژنۆن
وا دەزانن کونی ئۆزۆن هۆی گەرمایە؟
ئەی زاناکان ئێوە هەڵەن لەو هەرا یە
لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەکەن بەدەیان ساڵ
ئەنجام هیچە وەکو مێشکی خۆیان بەتاڵ
کونی ئۆزۆن نەبا هەناسە وتەنگ دەبوو
دنیا پڕی پەتاو ئاشوب وجەنگ دەبوو
ئەو دنیایەش ئەقڵی هەیە وای تێ مەگە بەکوخ ولیس!
کونی ئۆزۆن فڕێ دەدا هەناسەی پیس

ناهێڵــــێ ئــــەو گــــازە پیــــسە ببــــێ قــــەتیس
دەی بـــــزانم مــــستەر وڵــــسن ، ئەدواردەســــیس*
ئــــەو كونــــەی قــــازانجی زۆرە وكەمــــە زیــــانی
بــــۆ دەیگــــری ؟ تــــۆ زانــــای یــــان بەســــتە زمــــانی ؟
ئــــەویش بگــــرن لــــەجێ ی تــــر كــــون دەبێتــــەوە
بیرێكی بۆش لە ناو ( مێشك ودەماغ ) و دادەخولیتەوە
ڕۆژێ دادێ وە دەر دەكــــــەون دەیــــــان خــــــۆر
سەیرە خۆ یەك خۆرمان هەبوو بۆچی بون زۆر
گــــەرمای دنیــــا هــــۆی بونیــــادی ئــــەم خۆرانــــەن
پێشبینی یەكەم ورد سەیركە هەموو پەندو هەمو وانەن
ئەوەی لات گرێ كوێرەیە سەرت دەرناچێ لێ یەوە
ئەو فكرەی لەمێشكت دا یە چەند ساڵ خەریكی پێ یەوە

---

*مستەر وڵسن و ئەدوارد : مەبەست لەناوی زاناكانی گەردوون ناسی یە .

هــەموی بەڕێناســی بلّــێ ئــەویش ورد بــەئێوە دەلّــێ
دەتــوانی بیانکاتــەوە گــرێ کــوێرەی گــشت مەتــەلّی
ئــەو خۆرانــەش بــۆ ســەر ژ یــان مەترســی نــین
چــونکە وەکــو خــاوەنی زیــڕ چــاو برســی نــین
تـــەنها ئەبێتـــە هـــۆی گـــەرما لەســـەر زەوی
دوور مەبینـــە نـــەوەت چـــاوی پـــێ بکـــەوێ

هەولێر / ٢٠٠٨

## (( تیشکی سوور ))

تیشکێکی سوور شەپۆل ، شەپۆل
وەکو ئەسپ دەکا سمکۆل
لە ڕۆژەوە بۆ زەوی دێ
لە ڕ ێبواران ون ئەکا ڕێ
بە دەنگی وا بە گۆڵە گۆڵ
گەر مەبێ دنیا وخاك خۆڵ
لە و کا تەکە ئەوە ڕویدا
گەر دەلولیش دەبێ پەیدا
خۆهەڵکوتن بۆ کونە شاخان
بە جێ بێڵن ڕەزو باخان
گەر نەشمرن کوێر ئەبن
لە دەردی سەری تێر ئەبن

گــــــەر دەتانــــــەوێ نــــــەمرن
ڕێگــــای کونـــە ئەشـــکەوت بگـــرن
بڕۆنــــــە چـــــیاو ئەشـــــکەوتان
لــــەوێ بکــــەن شـــەن‌و کـــەوتان
ئـــــەوە مانگــــــێ دەخایـــــەنێ
(تێـــل )یـــش دەنگـــت ناگەیـــەنێ
لــــە بـــیرت نەچـــێ چـــیا ودۆڵ
دەرمانتــــــە ئەشـــــکەوتی قـــــۆڵ
واز لــــە پــــارە وپولــــت بێنــــە
دەســــــتەو ئـــــەژنۆ دامەمێنـــــە
جلێکـــــــی ســــــپی بـــــــسێنە
مەزانــــــە دەیکـــــەم هوڕێنــــــە
گـــــەر دە تانــــــەوێ بمێـــــنن
پێــــشبینی یەکـــــەم بـــــسەلمێنن

لەبیر لادە قەدی باریك
برۆنە ئەشكەوتی تاریك
نیوەی دنیا یە تیا ئەچێ
قەسەی منتان لەبیر نەچێ
خەڵكێكی زۆر زۆر دەمێنن
ئەگەر قسەم بەجێ بێنن

قەڵادزێ / ٢٠٠٩

## (( تەزرەی ڕەش ))

هەر دیومانە تەرزەی سپی
قەت دانابارێ بەکپی
هەر بەلێزمە دادەبارێ
نەمدیوە لەسەرخۆ جارێ
نەمان بینی تەزرە ڕەش بێ
وا دێ ئەم بارەمان بەش بێ
تەزرە نین بەردی بچوکن
قورسن وامەزانە سوکن
سەنگیان وەکو ڕەزای منە
ئامانجیان هەنجن هەنجنە
لە ئاسمانان دێنە خوارێ
هەزار دەنکی بەدینارێ

لەبـــەر ئـــەو بـــەردە بـــچوكە
خـــۆ وەشـــیرە خێـــرا زووكـــە
دەزانــــی بـــرا بـــڕۆ كـــوێ ؟
بـــڕۆ ئەشـــكەوتێ ســـەر لـــەنوێ
ژێـــر زەمینـــت هـــەبێ باشـــە
ئـــەوی تـــر هـــەموی بەلاشـــە
دوو ڕۆژی ڕێـــك هەتـــە مـــەحال
لـــەناو یـــەك نـــێن شـــڕو شـــیتاڵ
ئێـــستا نیـــشانەو پـــێ دەڵـــێم
خـــۆ نـــاكرێ لـــە دەســـت و هـــەڵێم
هـــەڵ ئـــەكا ڕەشـــە بـــا ێـــی تونـــد
ئەگرێتـــەوە گـــشت شـــارو گونـــد

خـــۆ وەشـــێرن لـــە كـــونی مـــاڵێ
نـــەوەك ئـــەو بايـــە ڕاو مـــاڵێ
شـــەش كـــات ژمێـــر بەردەوامـــە
تەمـــــــەنی بايـــــە ، تەمامـــــە
دوو ڕۆژ پـــێش ئـــەو دابارينـــە
ســـەيری ئاسمـــانی كـــەو ببينـــە
دوو ئەســـتێرە خـــۆ لێـــك دەدەن
مليـــار پـــشكۆ ســـەما ئەكـــەن
گـــەر ئـــەوەت دی خێـــرا ڕاكـــە
تـــازوە ئەشـــكەوت پەياكـــە
خـــۆ دەزانم نامكـــەن ســـوپاس
پـێم دەڵـێن : شـێت بـووە ڕێنـاس

قەلادزێ / ٢٠٠٩

# (( پەتا ))

کـــە دەنوســـم ئـــەو هەڵبەســـتە
دەردو نەخۆشـــــیم مەبەســـــتە
ئێـــستا هـــەرای یـــەك پـــەتا یـــە
بـــــلاوە وا لـــــەو دنیـــــا یـــــە
ئـــەو یـــشیان پـــەتا ی بـــەرازە
کـــە ســـەری هەڵـــداوە تـــازە
بـــــلاو بـــــۆوە لـــــەزۆر وولات
دەیگـــرن خـــەڵك ســـات بەســـات
لـــە پێـــشدا پـــەتا ی پەلـــەوەر
بـــەراز ئـــەو کـــات نـــەیبو خەبـــەر
یەکـــەمیان هـــیچ ، نەچـــووە ســـەر
دووەمیـــان بـــای خـــۆی دای زەرەر

خوشک و برام ها ببینە

هەڵامەتی کەرە شینە

یاخود دەردی مانگا سورە

هەرچەند لێم وەرناگرن تورە

هەڵامەتی بزن و مەڕە

هەڵدە لوشێ ووشک وتەڕە

لەدنیا ئاشتی یە ، نەشەڕە

لای تەنکی دەدڕی بەڕە

کە زانیتان لە دنیا یێ

شەڕ نەماوە و تەقە نایێ

بکەن چاوەڕوانی پەتا

پەتام لێ د یارە ئەوەتا

گەر ئێستا کە ئامادەبی
خۆ خراپ نیە چا دەبی
پتر دەپارێزن خۆتان
دەبێتە چارەسەر بۆتان
لێرە کەمتر خەڵك دەگرێ
(چین ) و(هیند) زۆربەی دەمرێ
پەیدا نابێ چارەسەری
تۆش وەکو من خەم لە بەری
ئینگلیز وڕوسیا و ئێران
ئەو پەتا یە دەیکا وێران
ئەو پەتا یە لەو سەدە دێ
ها کا ئەو بەڵا بەدە دێ

قەڵادزێ / ٢٠٠٩

# دارستان

دار ئێــــستاکە چــــەندە بــــەرزن
هـــــەزاران جـــۆر هــــەزار تـــەرزن
هەیانەســـــی مــــــەترە بــــالآی
بــــەڕەنگی جــــوان ، ئـــــاڵ و والآی
هەیــــە دەیـــــە هەیـــــە بیــــستە
لــــــەجوانی بەلگــــــە نەویــــــستە
چـــــەند جـــوانن چـــەند دلگـــیرن
بـــــەر تــــاڵن یـــا تـــرش وشـــیرن
هەیانـــــــە بەتەمـــــــەن پـــــیرن
بەســــــەدان ســــــاڵی لـــــــەبیرن
هەنـــــە بەبـــەر هـــەن بـــۆ بـــەرن
هەنـــــــە درەخــــــتی ســــــێبەرن

هەیـــــە بلْنــــد هەیـــــە نــــــەوی
ڕەگیـــــــان چـــــۆتە نـــــاخی زەوی
تاســـــەر بـــــەم جــــۆرە نـــــامێنن
لـــــەبالا یـــــا کـــــورتی د ێـــــنن
ســـــنەوبەر دەبنـــــە چـــــوار مـــــەتر
دەشـــــێ لـــــە بـــــۆ داری کـــــەپر
کـــورت ئـــــەبێ بـــــالا ی کـــــالیبتۆس
بـــه قـــەدەر (خـــەرتومی مـــامۆس*)
بـــــاش گـــوێ بگـــــرە مامـــە قالـــــە
مـــــەلێ ئـــــەو قــــسە بەتالْـــــە
گـــــوێزو داربـــــــەڕوو چـــــــواله
وەکـــــو گـــــولی زینـــــەی مالْـــــە

* خەرتومی مامۆس : لوتی فیل

بـــــير بكـــــەوە ڕابمێنـــــە
مێـــــشكت دوجـــــار ڕاهەژێنـــــە
هـــەر خـــەریکی خـــواردن مەبـــە
وورگـــــت دەبێتـــــە دەبدەبـــــە
گـــەر بـــە وورگـــت بـــدەی پـــشوو
مێـــشکت کـــار ئـــەکا زوو بـــە زوو
ئـــەو مێـــشکە چـــۆن پـــێ ی دەکـــرێ
بـــەری بـــیرو وورگـــــت بگـــرێ
خـــەریك نـــەبین بـــەپارەو پـــول
لـــە تـــێ فکـــرین هەڵکـــشیین شـــول
مـــــن مێـــــشکم ناحەســـــێتەوە
بیرێـــــك دەڕوا یـــــەك دێتـــــەوە

قـــــەيناكا خزمــــــەتت ئەكــــــەم
لـــــە ئـــــێش و ئـــــازارت ئەگــــەم
پێـــــت دەڵـــــێم ئـــــەوەی کـــــەزانیم
خۆشـــــــم لەئـــــــەقڵم ڕەزانـــــــیم
بەقورســـــی تـــــۆش تێدەگــــەی لـــــێم
کــــــە باســـــی دارو پـــــێ دەڵـــــێم
ئـــــــەوەی ووتم گــــــشت تــــــەواوە
دار بـــــــــاڵای ئەکـــــــــشێتە دواوە
داری گــــــــەورە دەبـــــــن بـــــــچوك
مێـــــو دەبێتــــــە پنجــــــە خڕنـــــوك
مەبەســـــــــتم باڵایـــــــــە لێـــــــرە
کـــــاکی بـــــرا گــــوێ ڕادێـــــرە

لەوەیـــــە نـــــەبینی ئـــــەتۆ
عـــومرت هـــەزار ســـاڵ نیـــە خـــۆ
ئـــــەو قـــــسەم بـــــۆ زانایانـــــە
ئـــــەوانیش هێـــــشتا مایانـــــە
دەبـــــێ لێکـــــۆڵینێ بکـــــەن
ئنجـــا لـــە مەبەســـتم ئەگـــەن
بـــــرام ، تێگەیـــــشتی کاکـــــە
مەبەســـتم چـــی یـــە ؟ ئێـــستاکە

قەڵادزێ / ٢٠٠٩

## (( سەرۆکی فەڵەستین ))

نـــــابینی خــــــەڵکی فەلەســــــتین
ڕۆژی نــــــەگێڕن گەرمـــــــەی شـــــین
قورپیـــــان جــــێی تــــــر ئەگرێتــــــەوە
لــــەنێوان خۆیــــان لەگـــــەڵ (چــــین)

★ ★ ★

ســــــەد بـــــاپیرم بـــــیری نـــــا یـــــە
ئـــــەو خاکـــــە لـــــەو حاڵـــــەی دا یـــــە
ئاشــــــتی عـــــــارەب . ئیـــــــسرائیلی
پـــــێم بـــــاوەڕ بکـــــە زوڕنایـــــــە

★ ★ ★

ئـــــەوە یـــــاری پەیـــــژە ومـــــارە
ســـــەد جـــــار ئەبتـــــەوە دوبـــــارە
چـــل ســـەدەیە (غـــەززە) ی واشـــوم
گونـــــدە پـــــەپوی ئـــــەو کـــــەنارە

★ ★ ★

ئـــــەو خاكـــــە ئـــاوا هـــــەژارە
هـــــەر ســـــاوا يـــــە و دارە دارە
ســـــەرۆكى بـــــۆ دادە تاشـــــن
بـــا بـــزانين كـــێ يـــە ئـــەو جـــارە

★ ★ ★

يـــــەكى كورتيلۆكـــــەى چـــــاوزيت
نـــاوى نـــاهێنين پيـــت بـــەپيت
ئێـــستا كـــــەخۆى حـــــازر دەكـــــا
دەبتـــــە ســـــەرۆك لـــــەمنى كـــــەويت

★ ★ ★

ئـــەو كەســـەش كـــاك (٥٠٠٠٠س ) يـــە
لەزينـــــــدانى خـــــۆى ناســـــيە
هـــــەموو شـــــتى لـــــەبير دەبـــــى
بـــــەس عـــارەبى لـــەبير نـــى يـــە

★ ★ ★

دەبتـــــە ســـــەرۆکی فەلەســـــتین
ئـــــەو قـــــسانەم هـــــەموو ڕاســـــتین
بـــــەردەوام دەبـــــێ ئـــــەو کێـــــشە
کاکـــــە ، ئێمـــــە نەیـــــەك ئاســـــتین*

★ ★ ★

ئـــــەوە مـــــاوەك دەخایـــــەنێ
جـــــا وەرە دانـــــی پیامـــــەنێ
خەڵکەکـــــەی پـــــشتی تـــــێ دەکـــــەن
دەمێنێتـــــــــەوە بەتـــــــــەنێ

قەڵادزی /۲۰۰۹

---

* کاکە ئێمە نەیەك ئاستین
مەبەســـت لـــەحاڵی خـــەڵکی کوردســـتانو
فەڵەستین وەك یەك نی یە .

## (( کەرە بۆر ))

ڕۆژێ دادێ بـــــــۆرە کـــــــەر
دێنـــــــێ دەلانـــــــد کـــــرۆزەر
کـــــەرە بـــــۆرە د ێتـــــەوە
ماشـــــێن دەمـــــا شـــــێتەوە
دەبنـــــەوە خـــــاوەن خـــــاوەن
جاشـــك و کەرۆکـــەی مەفتـــەن
نامێنـــــێ بـــــاوی ماشـــــێن
ســـــپلێت چـــوو دێ باوەشـــێن
ئـــەی زانـــا یـــان داوە شـــێن
بـــەس کلکـــی خـــۆ ڕاوەشـــێن
کـــوا ئـــەقڵ وداهێنانتـــان
بـــابردی ڕەنجـــی شـــانتان

ناشمێنێت تراکتۆر
نێری بەستە لەگای سۆر
لەجێ ی شۆخە دەراسە
ئێستا باو باوی داسە
خەرمانکوت بو دەر بەدەر
بەخێر بێ یەوە جەنجەر
لە تفەنگین بێ خەبەر
هاتەوە کۆتە خەنجەر
یا جوتیارن ، یا ڕاوکەر
کوڕە دکتوراو ماستەر
قاپی قوڕە سەراسەر
تێ ناگەن مانای کاستەر

پێ ی بڵێ ی چی یە کێشوەر

لە بۆی دەلە قێنی سەر

هەرکەسێ لەدەشت ودەر

بۆ خۆی دەبێتە عەنتەر

دەگۆڕێ ڕەنگی مووی سەر

سپیش دەبن بە ئەسمەر

مووی لەشیش هەلوەریوە

مرۆڤی ئاوات دیوە

پێویست نی یە تاخمەتراش

ناناسێ برا براش

بگرن ڕێزی گیان لەبەر

پێشبینیم بکەن ئەزبەر

ڕۆژێ دادێ بـــــــۆرە کـــــــەر
دێنـــــــــی دە لانــــــــدگرۆزەر
زەڕەی وەك مۆســــــــــــیقایە
سمێـــــــان لەخەنەنایــــــــــە
پــــــەرپوت نیـــــە بــــــەڕێزە
کـــــەرە بـــــۆر کـــــەرە دێـــــزە
ئـــــەو قـــــسەم نەکـــــەن لـــــەیاد
پـــــێی دادەن جـــــل و لبـــــاد

قەلادزێ / ٢٠٠٩

## (( بارانی ماسی ))

زۆر زۆر حـــــەزم لەماســـــی یــــە
لــــــەوەتای ماســــیم ناســـــی یـــــە
گۆشـــتی ئـــەو چـــاکترە بـــۆ لـــەش
کەچـــی پـــڕ ئێـــسك و داســـی یـــە

★ ★ ★

ئێـــوەش ڕەنگـــە حـــەزو لـــێ بـــێ
ئەگـــەر نێـــر و ئەگـــەر مـــێ بـــێ
زۆر بـــەی خـــەڵك حـــەزی لـــێ یـــە
گـــەر شـــاری بـــێ یـــا لـــە دێ بـــێ

★ ★ ★

ماســـــی لــــــەئاو نــــــەبێ نـــــاژی
لـــەڕاو ، دەشـــت خۆشـــە بـــۆ تـــاژی
هـــەر شـــوێنەو بـــۆ شـــتێ چـــاکە
وەکـــــو پێـــــستە لـــــــەبۆ ژاژی

★ ★ ★

بـــــۆ هەڵۆیـــــە لوتکـــــەی چـــیا
بـــــەهاریش نـــــا یــــە بـــــێ گیـــا
ماســـــیش لــــە ئـــاوێ دەربێنــــە
گیـــانی لەجەســـــتە دەبـــێ جیـــا

★ ★ ★

بـــــەڵام ئـــــەوەی مـــــن دەمـــــەوێ
لێـــــــوانم لەســــــەری بــــــدوێ
ماســـی لــــەئاسمان د ێنـــە خـــوار
ماســـــی تـــــازە جـــــوان ونـــوێ

★ ★ ★

ماســـــی بـــــچوك تـــــانیو کیلـــۆ
لــــە ئاسمانـــێ دێـــن کـــۆ بـــەکۆ
ئەســــەف ناگەنــــە لای ئێمــــە
بـــۆ ماســـی بــــڕۆ ســــوریا تـــۆ

★ ★ ★

خەڵکی مصرو خەڵکی یۆنان
ماسیان لێ دێنە سەربان
پێ یان شتێکی زۆر سەیرە
ماسیان دەسکەوتووە ئاسان

★ ★ ★

لەو سۆماڵ و لەم یەمەنە
کەس ناڵێ ماسی بەچەنە
هەر وەکو پوش و پەڵاشی
کۆدەکرێنەوە بەشەنە

★ ★ ★

دادەبارێ لە ئیندەنوس
ئەو ماسی ئاوا جوان ولوس
یابانیش دەیگرێتەوە
بەس ناگاتە ووڵاتی ڕوس

★ ★ ★

لەئەمەریکاش دادەبارێ
هەزار ماسی بە دۆلارێ
خەڵکەو سەیری ئاسمان دەکا
هەر ماسی یە و دێتە خوارێ

★ ★ ★

پێ یان خەنی دەبن گۆشت خۆر
دەبارن ماسی جۆر بە جۆر
هەمو شتێ بێ تام دەبێ
گەر وای لێ هات زۆری زلۆر

★ ★ ★

گوێت لێ بێ قسەی ڕێناسی
دەبێ دابباری ماسی
بەهەردو چاوی خۆم بینیم
دادەبارین بە کەساسی

قەڵادزێ /٢٠٠٩

## جێگری نەوت

لـــــەوەتای بــــەکار دێ نـــــەوت
لــــەو ڕۆژە دەســـــت مرۆڤـــ کـــەوت
ســــودی هــــەبوو بــــۆ دنیــــایێ
ڕۆشـــــن بـــوو ، تــــاریکی شـــەوت

★ ★ ★

پێمــــان وایــــە ســــودی زۆر بـــوو
کارگــــەو مــــا شــێنیش زلــــۆر بــوو
بەرامبــــــەر ســــود ، زیانیــــــشی دا
ئـــەو ئـــۆزۆنی پـــێ کلـــۆر بـــوو★

★ ★ ★

خـــــەڵکی فێـــری تەمبــــەڵی کـــــرد
بــــەکار یــــان هێنــــا گــــەورەو وورد
ئــــەوەی خۆمــــــان ســــــوتاندمان
زۆریـــش خـــەڵکی لــەبۆ خـــۆی بــرد

★ ★ ★

★ مەبەست لەوەیە کەلەبەر ئەو دوکەڵی ماشێن و کارگانە کە سەرچاوەکەیان نەوتە، زەوی بەرگە هەوای ئۆزۆنی خۆی کون کردوە، تاکو تەمەنی زەوی درێژت بێت

خەڵك لەسایەی برسی بوو
بۆ ئێمە هەر مەترسی بوو
داگیر کەر هەڵی دەلوشی
سەری ئێمەش ، پێ ی کوسی بوو

★ ★ ★

سوپاس بۆ خوا کەمی ماوە
بیر قورەیان لێ هەڵساوە
هەرچی هەبوو بە تالان چوو
تەپڵی بنی هەڵتەکاوە

★ ★ ★

بەلام لەجیات ئەو شتێ تر
سازو ئامادە یەو حازر
جێگەی نەوت دەگرێتەوە
من قسەکەر ئە تۆ گوێگر

★ ★ ★

شـــتێ پەیـــدا دەبـــێ بـــەردە
هەیـــە لـــەو چـــیاو لـــەو هـــەردە
لەنـــــەوت گـــــەلێ چـــــاترە
والەســــــــەرم لادا پـــــــەردە

* * *

بەئاســــــــان ئەتاوێتــــــــەوە
جێگـــــای نـــــەوت ئەگرێتـــــەوە
کاکـــــە نزیکـــــە لێتـــــەوە
خـــــەڵکی پـــــێ دەحەســـــێتەوە

* * *

ئەگـــەر ئـــەویش نـــەخوا ســـەرمان
نەبتـــە ئـــاگر کراســـی بـــەرمان
خوایـــە کوردســـتان ئاواکـــەی
لـــێ ی نەســـوتێ چـــیتر خـــەرمان

هەولێر /٢٠٠٥

## (( هەولێرو بومە لەرزە ))

ئـــەی شـــارەکەم بـــە داخـــەوە
بـــۆت غـــەمگینم لـــە ناخـــەوە
پەرســـتگای چـــەند خواوەنـــدان بـــوی
ئـــاوت بـــۆ هـــات لـــە شـــاخەوە*

★ ★ ★

شـــارێکی گـــەلێ جـــوان وخـــۆش
(ئەسـکەندەر* ) بـۆت هاتـە کڕنـۆش
کەلـــــە یۆنـــــانی هاتـــــە دەرێ
دەگـــیری کـــرد تـــا هینـــدو کـــۆش

★ ★ ★

ئـــەی شـــاری ســـولتان موزەفـــەر
وولاتـــــی عـــــوزیر پێغەمبـــــەر
شـــــاری ســـــەدی وەك مـــــستەوفی
چـەند جـوانی لەوسـەر بـۆ ئـەم سـەر

★ ★ ★

---

★ ئـــاوت بـــۆ هـــات لەشـــاخەوە : مەبەســـت لەکارێزەکانی هەولێرە .

★ ئەسکەندر : مەبەست لە ئەسکەندری گەورەیە

شاری موفتی وشاعیرانم
لەلانەت بۆوە چاوانم
خۆشم دەوێ ی بەقەددرخۆم
بۆ نسکۆت چاو بەگریانم

* * *

جێ ی فەندی وبێ بەش وکانی
نمونەی پیاوەتی وجوانی
بومەلەرزە دە تهەژێنی
ڕێناس گەلێ شت دەزانی

* * *

بەداخەوە بومەلەرزە
کە دەهەژێنێ ئەم ئەرزە
لایەکی قەڵات دەڕوخێ
لەگەڵ ئەو مینارە بەرزە

* * *

ئێستا کەوا من لەژینم
زیندوم دەکەم گەرمەشینم
ئەی خودایە چاوم کوێرکە
با هەولێرئاوا نەبینم

* * *

دەك بتەقێ مۆخی پڕکام
کە ئەو وێنەی وانیشاندام
هەولێر ئازاری پێ نەگا
بەو ئاوات وخۆزگە وبریام

* * *

کەڕو دەدا بومەلەرزە
پایز دەبێتن ئەو وەرزە
زەویش هەندێ شوێن ڕۆدەچێ
لە پێش چاوومە ئەو دەرزە

هەولێر / ٢٠٠٨

## گرانی

گرانیـــــەك پەیـــــدا دەبـــێ
خـــەڵك لـــەو دەشـــتە ڕادەبـــێ
گـــژو گیـــاش هـــەر هەڵدەلوشـــن
دوای چـــوار ســـاڵ ئنجـــا چـــا دەبـــێ

★ ★ ★

بـــاوك دەخـــوا گۆشـــتی کـــوڕی
پیـــاو لـــە پیـــاوی تـــر دەمـــڕی
یـــەکێ بـــچێتە ســـەر لاشـــەیێ
بیـــست قـــەلی لەســـەر دەفـــڕی

★ ★ ★

ئـــەوەی ووتم هـــەر دەبـــیتن
ئـــەم وێنانـــەم ئـــەمڕۆ دیـــتن
دەوڵەمەنـــدیش دەگرێتـــەوە
بـــەوەی نیـــە ئـــاوا قـــیتن

★ ★ ★

ئێــــستا بینــــــیم گرانـــــی بـــــوو
بـــۆ نانـــێ هـــانی ، هـــانی بـــوو
هەنـــــدێ بــــــەردی چـــــنراوم دی
حـــەوت ســاڵ پــێش ئێــستا کــانی بــوو

★ ★ ★

لاشــــە هـــــەموو ووشــــك ببــــوون
هێلانــــەی جـــرج ومـــشك بـــوون
جرجـــــە بـــــۆرە ومـــشكە زیتـــــە
بەکـــەیفی خـــۆ ســـەر پـــشك بـــوون

★ ★ ★

کاتـــێ دوو ســـێ برســـی هـــاتن
جـــرج ومـــشك چـــاك هـــەڵاتن
ئاهـــا برســـی کەوتنـــە دوا یـــان
فایـــدەی چـــی واکـــش ومـــا تـــن

★ ★ ★

زێـــڕو زیـــو کـــەڵکی نامێنـــێ
کونـد* لـە تەشـتی نـان ئـەخوێنێ
یـــەك تەشـــتەزێڕ نانـــێ ناکـــا
گرانیـــە لـــە گـــشت شـــوێنێ

★ ★ ★

ئـــەوە دەخایـــەنێ چـــوار ســـاڵ
دەڕوا چـــوار ســـاڵی ئـــاوا تـــاڵ
ناگاتـــە ســـەد ســـاڵ ئـــەوە دێ
ئاگـــاو لـــەخۆ بـــێتن منـــداڵ

★ ★ ★

ڕۆڵـــەی مـــن ژیـــاوە وبـــۆ ژیـــن
هـــەرژینی مـــن کاکـــە لـــۆژین
ئەگـــەر نـــەمردن مـــان لـــەژین
بـــەخودای خـــۆ وبـــێ بـــڕوای بـــەتین

سلێمانی / ۲۰۰۹

* کوند: کوندەپەپو

## (( ئاژاوەی هیندستان ))

ئـــەمڕۆ هینـــدم دیـــت بـــەم جـــۆرە
دەکـــــــەوتن لاشـــــــە بـــــــەنۆرە
بـــەو چـــاوانەم بینـــیم کـــە ، وەك
مـانگ چـۆن مانگـە وخـۆر چـۆن خـۆرە

★ ★ ★

شـــەڕ پەیـــدا بـــوو لەســـەر ئـــایین
وەرە بـــــۆ لام ، بیـــــا پـــــاین ★
بەچـــاوی خـــۆت نیگـــا بکـــە
شـــەڕ کـــەر لەســـەر پـــشتی مـــاین

★ ★ ★

ســـــەر لەلاشـــــە جـــــودا دەبـــێ
شـــــەڕێکی وا پەیـــــدا دەبـــــێ
هەلایـــــە ، شـــــەڕە ، ئـــــاژاوە
نێـــرو مـــێ بـــۆ چـــەك ڕادەبـــێ

★ ★ ★

---

بیاپا ین / بە فارسی مانای ( وەرە ئێرە ) یە .

لەیستۆك لەباوەشی مندالّ
پێی دارڕژاوە خوێنی ئالّ
کەچی هەر لە باوە شیەتی
کوشتیان چەقالّ و بەقالّ

★ ★ ★

سەنگی بەقالّ چەقۆی قەساب
چەکوشی وەستا ، شیشی کەباب
هەمو بۆ کوشتن بەکار دێن
وا ڕودەدا لەمانگی ئاب

★ ★ ★

(هیند ) لەناوخۆی دەبێتە شەڕ
دنەی دەدەن خەڵکی بەد فەڕ
خەڵکێکی زۆری تیا دەچێ
وێکڕا دەسوتێن وشك وتەڕ

★ ★ ★

چاوت لەکێ دیارە غاندی
گەلت قوڕ بە سەرو ماندی
دار بەری گرت ، دروست بوشەڕ
ئەو تۆیەی دوژمنت چاندی

* * *

پەرستگاو مزگەوت دەڕوخێن
بەخودای یەکتر دەدەن جوێن
دیندار لەدوای یەکتر دەچن
بۆ کوشتنی شوێن لەدوای شوێن

* * *

پاکستانیش هێرش دێنێ
نیو دەلهیشیان دەڕوخێنێ
ئەو پێ ی وا یە هەقی هەیە
تۆڵە لە (هیند ) ان دەستێنێ

* * *

بــــەکار نـــا یـــە چـــەکی ئـــەتۆم
هنـــد دەبێتـــە بـــەردی بـــن گـــۆم
لێـــرەش خـــەڵك پـــێ ی ناخۆشـــە
زۆر تریـــان پـــێ ناخۆشـــە(دۆم) ★

★ ★ ★

دە ســــالّم دی بـــــەم شـــــێوەیە
ئـــــەو شــــەڕەی وا بەڕێوەیـــــە
داگیرکەریـــــــشیان ڕامــــــالّی
ئێـــــرە نـــــەمالّی ئێوەیـــــە

★ ★ ★

لـــە نـــەوەی غانـــدی کەســـێ هـــات
ئـــــەو هندســــتانی دا نـــــەجات
ئاشـــتی نـــاوخۆ بـــەر قـــەرار بـــوو
داگیرکـــــەری لەبـــــەر هـــــەڵات

هەولێر / ٢٠٠٥

---

★ دۆم / عەشـــیرەتێکی کۆچـــەرن لەکوردســـتان ، لەبنەچە خەڵکی هندستانن .

## دوا ڕۆژی عێراق

ئـــــەو عێراقـــــەی بینیتـــــە تـــۆ
هەڵدەپـــــەڕێ بـــــێ دەســـــتی دۆ
تەخـــــشان وپەخـــــشانی ئـــــەکا
دەمـــــی تیـــــژی شـــــیرە کلـــۆ

★ ★ ★

خـــاکی بـــە پیتـــی گـــەنم وجـــۆ
ئـــەی مەفتـــەنی گـــۆتی ولۆلـــۆ
ئـــــەی وولاتـــــی ئـــــامۆڕابی
ئـــەی جـــێ نزرگـــەی ســـۆپارتۆ

★ ★ ★

ئێـــستاش لەبـــەر کـــوردان نـــەبێ
تەقـــــە لەلاشـــــەت هەڵدەســـــتێ
ئـــاخۆ بـــو بایـــە چـــەند پارچـــە
بـــــەدەمی تیـــــژی مقەســـــتێ

★ ★ ★

وولاتـــــی ئاشــــوری وکلــــدان
ئـــــەی وولاتم (خیرالبلــــــدان )
بینـــیم تۆیـــان کـــردە پێـنج بـــەش
وەك پارچـــەی مـــەرکان وگوڵـــدان

* * *

ئـــەی جـــێ نزرگـــەی بـــاپیرم
ئـــەوەم واپـــێ دەڵـــێ بـــیرم
نـــازانم مـــن بـــۆ وا خەمـــە
ســـەری پیـــازم ، قنـــچگی ســـیرم ؟

* * *

چـــی بکـــەم خـــەمی لـــێ دەخـــۆم
عـــیراق ئـــاوای لـــێ بـــێ دەڕۆم
چـــونکە بەگـــژ یەکـــدا دەچـــن
خـــەمی وەمـــە ، نۆکـــەری تـــۆم

* * *

ئەو عیراقە وا نازدارە
ئاوارەیی و بارە بارە
دەستی نەگریسی دەگاتێ
لاشەی دەکەن پارە پارە

* * *

ئێستا دەڵێن دەبتە سێ بەش
ئاوا دیارە بەڕوو کەش
مێشکم وێنەی تر دەبینێ
دەبتە پێنج بەش بێ غەل وغەش

* * *

عیراق دەبێتە پێنج وولات
سێ دیارن دنیا باس ئەکات
(کەرکوك ) و(بەغدا) ش سەربەخۆن
ڕۆژ هەر هەڵدێ لە ڕۆژ هەت

هەولێر / ٢٠٠٤

## (( دوا ڕۆژی کەرکوك ))

کـــــەرکوك شـــــاری برایـــــەتی :
بـــۆ کـــورد دەســـتە هـــەم پایـــەتی
کـــــوردی زۆر بونـــــە قوربـــــانی
تـــــامردن کـــــورد تەمایـــــەتی

★ ★ ★

ئـــــەو گـــــڕی بابـــــەگوڕگوڕە
هـــــاوار دەکـــــا نـــــەوتم پـــــڕە
پـــــێم دەڵـــــێ : نـــــار الازلـــــي ★
ئێـــــرە حـــــەجێکی زۆر کـــــڕە

★ ★ ★

لـــــەکوردان ئەکـــــەن نکـــــۆڵی
ناحـــــەز هـــــەڵێ کێـــــشا شـــــوڵی
بـــــەڵام مێـــــشکم پـــــێم دەڵـــــێتن
ڕێنـــــاس بیرکـــــەوە تـــــۆ قـــــوڵی

---

★نار الازلی : ئاگرێکە هەزاران ساڵە نەکوژاوەتەوە لەنزیك کێلگەی نەوتی بابەگوڕ گوڕە ، من دڵنیام کە ئەو شوێنە حەجێکی کۆنی کوردە ، چونکە کوردان ئاگریان دەپەرست ، ئێ خۆناشێ ئەو ئاگرەیان نەدیبێ و بەرز ڕایان نەگرتبێ ، ناوی بابەگوڕگوڕە هەر لەوشوێنەوە وەرگیراوە /

ئەگـــەر عەرەفـــە هـــەبێ لەمەككـــە
بابـــەگورِ گـــورِیش هـــی وای لـــە تەكـــە
لـــەوێش گـــەرەكی عەرەفـــە هەیـــە
جـــوان تـــێ بفكـــرە وبەقـــسەم مەكـــە

★ ★ ★

كـــەركوك نـــەك شـــاری كوردانـــە
بـــەڵكو حـــەج و زێـــدی وانـــە
كـــورد كـــە ئـــاگری دەپەرســـت
(نـــار الازلـــــي ) نیـــــشانە

★ ★ ★

ئـــەو ئـــاگرەی خـــۆش جەمالـــە
لـــە گـــرِە هـــەزاران ســـاڵە
نەكوژاوەتـــــــەوە تائێـــــــستا
حـــەق دەڵـــێم هـــەر چـــەندە تاڵـــە

★ ★ ★

کوژاوە ئاگری زەردەشتی
بێ هێز بو نەیما برِەشتی
ئاگری پەرستگا کوژانەوە
یەك بەیەکی هەتا گشتی

★ ★ ★

تەنها ئاگری وامـاوە
کە ناوی گورِ گورِە باوە
ئەو ئاگرەی لەکۆنەوە
داگیرساوە ونەحەساوە

★ ★ ★

دوا دەکەم (کەونار*) ناسان
بگەنە ئەو شوێنە ئاسان
لێ بکۆڵن دەوروبەری
گوێ مەدەنە قسە وباسان

★ ★ ★

---

★کەونارناس: شوێنەوارناس

ئـــەو ئـــاگرەی پـــڕ شـــکۆیە
پەرســـــتگای بــــاپیری تۆیـــــە
ئێـــستاش بـــەرو بـــومی دەخـــورێ
ســـــاڵێ وەردو ســــاڵی شـــۆیە

★ ★ ★

ئێــــستاش قبوڵـــــە لای کـــوردان
برایـــــەتی هـــــەموو گـــــەلان
کـــورد حـــەزی هەرلـــە ئاشـــتی یـــە
بمـــان پـــارێزە خوایـــە گیـــان

★ ★ ★

ئـــــەوەی لێــــرە مەبەســــتمە
کـــــەزادەی ئـــــەقڵ وهەســـــتمە
وێنـــــەکی خــــراپ دەبیـــــنم
هـــــەواڵی لەبـــــەر دەســــتمە

★ ★ ★

کەرکوك پڕدەبێ لەلاشە
تفەنگ ، چەقۆ ، داروگاشە
لەهەمو لایەکی شەڕە
مردن واسوك وبەلاشە

★ ★ ★

لەکەرکوکێ دەبێتە شەڕ
دەنگی تەقەگوێ دەکا کەڕ
کەرکوك نیوەی لێ قڕئەبێ
وێکڕا ئاو ناخۆن گورگ ومەڕ

سلێمانی / ٢٠٠٤

## ( ڕونکردنەوەیەك بۆ کەرکوك )

مرۆڤ لە چاخەکۆنەکانەوە دیاردەی سروشتی پەرستوە بۆنمونـە زۆرجـار گوێمـان لـێ دەبـێ کەخـەڵك سـوێند دەخـوا جـاری واهەیـە لەسوێندەکەی دا دەڵێ (قەسـەم بـەو ئـاگرە ) یـان دەڵـێ سـوێند بـەو (ڕۆژ) ە یان سوێند بەو ئەستێرانە ئەوە مانـای ئەوەیـە کەلـە کۆنـدا باپیرانی ئێمە (ئـاگر وڕۆژ و ئەسـتێرە ) یـان پەرسـتووە بـەپیرۆزیان زانیـون ، کـوردیش ئـاگر یـان پەرسـتوە ئـەوە مەسـەلەیەکی حاشـا هەڵنەگرە وە شوێنەواری چەندین پەرستگای زەردەشتی لەکوردستان هەیە کە ئاگری پیرۆزی لێ پەرستراوە و ئەو ئـاگرەش نەدەبوایـە بـۆ ساتێکیش بکوژێتەوە ، من لە ئێوە دەپرسم ئـەی ئەگـەر ئاگرێـك لـە کەرکوك هەزاران ساڵ تەمەنی بێ و تاکو ئێستاش نەکوژاوەتـەوە بـۆ کورد ئەو ئاگرەی نەبینیوە لە چاخەکۆنەکاندا ؟ مـن دەڵێم لـە بـەر پـیرۆزی ئـەو ئـاگرە کەلـە نـاخی زەوی دێتـە دەرەوە و ئێـستاش مـاوە لـە کـەرکوك کـە بـە (نـار الازلـي ) ناسراوە لەبەر ئەو دیاردە سروشتی یە جوانـە کـورد بـۆ یەکـەم جار ئـاگری پـیرۆز کـردوە ، وەمـن لێـرەوە شـوێنەوار ناسـانی کـورد ئاگـادار دەکـەم کەبـچن کنـەو پـشکنین لـەنزیکی ئـەو ئـاگرە بکـەن

ئەو کاتە ڕون دەبێتەوە ، من پێم وایە کەرکوك نەك کوردستانە بەڵکو پیرۆزترین شاری کوردەو پەرستگای ئاگری پیرۆزی کۆنینەیە ، وە ڕایەکی تریشم هەیە دەپرسم بۆ دەبێ لەنزیك ئەو ئاگرە کەمن پێم وایە حەجی کورد بووە بۆچی گەڕەکێکیش هەیە بەناوی (عەرەفە) ئەگەر ووشەی (عەرەفە)لە ناوی (ئەرافا) یان (ئارابخا) ش وەرگیرابێ هێشتا تەمەنی لە (١٥٠٠) ساڵ زۆر زیاترە ، وەلامی ئەو پرسیارە بۆ ئێوە بە جێ دەهێڵم ، وە هیوادارم کوردەکانی دانیشتوی کەرکوك نەستەم لە کەس بکەن ، نەستەم و زوڵم زۆری لەکەسیش قبوڵ بکەن ، کورد هەر لەکۆنەوە ستەمکار نەبووە بەلاّم کە ستەمیشی لێ کراوە لەبەر قبوڵ نەکردنی ستەمەکە بەسەدان هەزار قوربانی داوە ، وە ئامۆژگاریشم بۆ سەرکردایەتی کوردستان ئەوەیە کە دڵنیابن کەرکوك شوێنێکی پیرۆزی کوردستانەو هیوادارم ئەوان حەکیمانەتر ئەو مافە بە حکومەتی بەغدا بسەلمێنن ، هەرچەند سەکردایەتی کوردستان تاکو ئێرە زۆر زیرەکانە هەڵس و کەوتی لەگەڵ کێشەی کەرکوك کردوە هەرچیەکیان کردبێ بۆ ئاشتی بووە ،چونکە کوردستان و سەرکردایە تیەکەی هەمیشە مەبەستیان ئاوەدانی وپێکەوە ژیان بووە .

## (( نقوم بوونی قوبرس ))

خاکـــت هـــەر دەڵـــێ ی جەنەتـــە
هەرچـــەند ئێـــستاکە دوولەتـــە
ناخۆشـــیەك لـــەڕێت دا یـــە
((ڕێنـــاس)) زۆر پـــێ ی نارەحەتـــە

★ ★ ★

دوورگەیـــەکی بـــوکی دورگـــان
بـــە پێدەشـــت وگـــردو زورگـــان
دەبنـــە خـــۆراکی ماســـیان
وەك مریـــشکی دەمـــی تورگـــان*

★ ★ ★

خاکەکـــەت ئەکەوتـــە ژیـــار ئـــاو
((ڕێنـــاس )) قـــسەی کـــردو تـــەواو
لـــەخۆو خـــەنی کـــەم مەســـرەفن
پێتـــان نـــاوێ ، نـــەگۆر ، نـــەجاو

★ ★ ★

---

* تورگ : گیاندارێکی گۆشت خۆرە لە ڕێوی گەورەترە

دەریـــا بـــۆت دێ شـــەپۆل شـــەپۆل
ژێـــر ئـــاو ئەکـــەوێ شـــوێنی قـــۆڵ
هـــــەر ڕۆژی لات ، هـــــەموو وولات
دەبێتـــــە دەریـــــا چـــــیاو دۆڵ

★ ★ ★

مێـــــشکم ئـــــاوا دی وێنەکـــــەی
یـــــاخوا ڕێنـــــاس هوڕێنەکـــــەی
هوڕێنـــــە نـــی یـــەو ڕاســـتی یـــە
مـــن چـــی بکـــەم ، هەســـتی پـــی نەکـــەی

★ ★ ★

ئـــــەو قوبرســـــی ئـــــاوا خـــــاتوون
وەك (ئـــەتلانتا ) نـــایمێنی شـــون ★
بـــــەرە بـــــەرە نـــــوقم دەبـــــێ
شـــــوێنی خـــــۆ بگـــــۆڕن ببـــــزون

★ ★ ★

قوبرس ئەی ووڵاتی قەشەنگ
چوار دەوری تەنیوی نەهەنگ
هەمیشە ئاشتیت ویستوە
هانات نەبردەوە بۆ جەنگ

* * *

ووڵاتی گەشت وگوزاری
لەهەر چوار دەورا کەناری
بەهەق ووڵاتێکی خۆشی
ساڵ بە ساڵ خۆزگە بەپاری

* * *

دەوڵەمەند بە شارستانی
ووڵاتی جوان پەرستانی
هەمیشە هەر ئاڵ و واڵای
جوانی دەڵێ ی کوردستانی

* * *

بۆخۆتان لەو شوێنە ڕەوکەن
لەسەر قسەی من گرەو کەن
ئەوی دۆڕا من حەق دەدەم
لەشوێنێکی تر درەو کەن

★ ★ ★

هەتا قاچتان دێشی هەڵێن
بەقسەم بکەن زۆری مەڵێن
ئەمن تازە وێنەکەم دیت
هەردێتەی جێ قسەم ، بەڵێن

★ ★ ★

قوبرسی تورك و یۆنانی
لێ ی نەجات نابێ یەك خانی
هەموی نوقمی دەریا ئەبێ
ڕێناس هەمو شت دەزانی

هەولێر / ٢٠٠٤

---

★ شون : شوێن پێ

## (( دەریای سپی ))

ئەو دەریای واجوان وسپی
بەبێ دەنگی و مەنگی و کپی
ئەتلانتای بەبنەخۆ دابوو
بەسەر قوبرسیش دا (ڕپی*)

★ ★ ★

چەندین بەلەمی سەهوڵدار
پێت داهاتن وەکو ڕێبوار
لەناوەڕاستێ قوتت دان
قەپت لێ دان وەك سەگی هار

★ ★ ★

بەلەمی کاسبی وجەنگی
لرفت کردن بەبێ دەنگی
بەلام لەقوڵایی خۆتا
مرۆشت دانا نهەنگی

★ ★ ★

قوتـــــت داچــــەند ژن ومنــــــدالْ
هەڵکــشای تــۆ ســالْ لــەدوای ســالْ
هــەمو بــەخوێ ، خــۆێیش بــەمانا
وێنــەی تــۆم دیــت کــەبوی بــەتالْ

★ ★ ★

کاتــێ قــوبرس ژێــر ئــاو کــەوت
لــــەبنی دەریایـــــێ خــــەوت
شــەش ســەد ســالّم دی ئــاوابوو
دەریــا بــۆ کــێ یــە کــۆچ ڕەوت

★ ★ ★

شــەش ســەد ساڵە قــوبرس نــەما
ماســـی لـــەناویان کـــرد ســـەما
هـــەزار وەلـــی هـــاتن وچـــون
نەگـــــەیین بـــــەبالاّی شــــەما

★ ★ ★

---

★ ڕپی : ڕوخا / ★ قەپ : قەپالْ

شەش سەد ساڵ دوای ئەو ڕوداوە
نەما لەو ناوە ئەو ئاوە
دەریای سپی ووشك ببوو
بەوەی نیە هەڵکشاوە

★ ★ ★

ووشك دەبێ ودەچێتە دواوە
شەپۆل و کەنار حەساوە
تەنها دەبێتە کانگای خوێ
چۆرێ نامێنێ لەو ئاوە

★ ★ ★

قوبرس نەما دوای شەش سەد ساڵ
دەریای سپی دەبێ بەتاڵ
ووشك دەبێ و نایمێنێ ئاو
هەردەمێنێ خوێ ی سوێرو تاڵ

هەولێر / ٢٠٠٤

## (( مەرگی ئەندەنوسیا ))

مـــەڕ بـــەخوری ، بـــزن بـــەموو
چـــۆن خوایەکـــەو ، شـــەو ڕۆژ دوو
چـــــۆن دەزانم قـــــەت دەرنابـــــێ
هـــەتا نێتـــە وەختـــی خـــۆی لـــوو ★

★ ★ ★

ئێـــستر بـــۆ بـــار ، ئەســـپیش ســـواری
کـــەر هـــەر کـــەرە ، چـــی یـــە بـــاری
چـــــۆن دەزانم ســــــاوای برســــــی
هــــەر بـــــۆ شـــیرە گریـــــە وزاری

★ ★ ★

چـــــۆن دەزانم ئـــــاگر گەرمـــــە
باوەشـــــی ژن یـــــەکجار نەرمـــــە
ئـــــاواش دڵنیـــــام لەمێـــــشك و
لـــــەو وێنـــــەی وا لـــــەناو ســـــەرمە

★ ★ ★

تێنو چەندی حەز لەئاوە
کچ حەزی لەقژی خاوە
ئەبەم جۆرەش من دەزانم
ئەوەی دەڵێم گشت تەواوە

★ ★ ★

زۆر تەواوە ئەوەی دەیڵێم
گرنگ نی یە بۆ خۆم لەکوێم
چونکە ئەوەی من ووتومە
یەك بە یەکی هاتۆ تە ڕێم

★ ★ ★

چیم وتوە وارویداوە
تۆز قاڵێکیش لای نەداوە
هەموی وەکوخۆی دەرچووە
وەکو تیشکی ئەم هەتاوە

★ ★ ★

---

★ لوو : دومەڵ

ئــــەوەی گــــەڕەك هـــەڵی ڕێـــژم
ئـــــەوەی مەبەســـــتە بیبێـــــژم
ئـــەو وێنـــەی لەبـــەر چـــاومە
دەری دەبــــــڕم و نــــا ینێـــــژم

★ ★ ★

ئــــــەقڵ دڵــــێ دەی بینوســــــە
بەدەســـــت بگــــرە ئـــەو پێنوســــە
ئـــــەوەی دەڵــــێم تۆمــــاری کــــە
تێـــك دەچـــێ ئـــەو ئەندەنوســــە

★ ★ ★

بــــەڵام ئـــەو جـــارە جیایــــە
ئەنـــــدەنوس نــــوقمی دەریایــــە
هـــەر هـــەموی ژێـــر ئـــاو دەکـــەوێ
(ڕێنـــاس) یـــش لـــێ ی بەئاگایـــە

★ ★ ★

ئـــــەو ئەندەنوســــــیای وا دەلال
ژێـــر ئـــاو کـــەوت شـــڕ و شـــیتاڵ
هەنـــــدێ کـــــەناری گرتـــــەوە
تـــسۆنامی ، هـــا ئـــەوێ ســـاڵ

★ ★ ★

چـــونکە بەچـــاوی خـــۆم دوێنـــێ
بینـــیم دەریـــا تـــەوژم دێنـــێ
گیـــان لەبـــەری ئەندەنوســـیا
هـــەر مەلـــەوانی ئـــەمێنێ

★ ★ ★

گـــوێم لـــێ بـــو منـــداڵ دەگریـــا
کاتـــێ لـــرفی دەکـــرد دەریـــا
خۆزگـــە منـــیش بـــێ خەبـــەربام
هـــەزار خۆزگـــەو و هـــەزار بریـــا

★ ★ ★

بینیم ئەو ئەندەنوسیایە
سەرتاپای نوقمی دەریایە
دارێکیشم لێ نەدەدەدی
کە هەیبێ دو قولانج سایە*

* * *

ئەو هەمو دورگە جوانە
کە جێگای گەشت و سەیرانە
ژێر ئاو کەوت و بو وێرانە
حەقیقەتە ، باش بزانە

* * *

ئەندەنوسیا دەبێ غەرق
داراو نەدار بەبێ فەرق
هەمویان ژێر ئاو دەکەون
باکور باشور ، غەرب وشەرق

هەولێر / ٢٠٠٨

---

* قولانج : لەبستێ کەمترە
* سا یە : سێبەر

## (( درێژ بوونی تەمەنی مرۆڤ ))

بــە ڕووتـــی بــوین ڕوتــیش دەڕۆیـــن
دەوڵەمەنـــدین یـــاخود بـــێ دۆیـــن ★
ئـــەوەی ڕەنجـــی بـــەبا نەچـــوە و
ئەوانەشـــــــی کەڕەنجـــــــەڕۆین

★ ★ ★

ڕێ ی هـــــەمومان هەرمردنــــــە
مـــوڵکی تـــۆ بـــێ ئێـــرەو ســـنە
ئەگـــەر بڵـــێ ی ئـــەمن نـــامرم
هـــەر نامـــا قـــوڵی کردنـــە

★ ★ ★

نەتـــدی مـــردن پاشـــاو وەزیـــر ؟
کـــەمیان قرتانـــد ملـــی ئـــەمیر ؟
گـــەلێ جـــاران بـــەخۆم دیومـــە
کاتـــێ ڕاوچـــی دەبتـــە نێـــچیر

★ ★ ★

---

★ بێ دۆ : بەمانای نەدار هاتوە

هەرچـــی هەیـــە دەبـــێ بمـــرێ
ڕۆحـــی بـــەرەو ئاسمـــان بفـــڕێ
هەیـــە گۆڕیـــشی بـــۆ نابـــێ
جەســـتەی تێـــدا ئـــارام بگـــرێ

★ ★ ★

ڕێگـــا زۆرن لـــەبۆ نـــەمان
ناتوانـــێ بیـــژمێرێ زمـــان
مـــرۆ لـــە هـــەوڵی ناکـــەوێ
بـــۆ نـــەمری هـــەر ئـــەدا وچـــان

★ ★ ★

یـــا نەخۆشـــی یـــا بـــەتاعون
هەرمردنـــە و هـــەر لـــە ناوچـــون
زۆرکـــەس ویـــستیان نـــەمرن
بـــەرەنگاری مـــردن ببـــون

★ ★ ★

نـــــەيانتوانى ڕێگـــــا بگـــــرن
ئــــەو ڕێ يـــــەی نـــــەهێڵێ بمـــرن
ئــــــەوە ڕێگـــــای هەموومانــــــە
کەچـــی خـــەڵکیش واپـــێ ســـرن *

★ ★ ★

هـــــەمو حەزدەکـــەن خــــزر بـــن *
لــــــەناو خۆشـــــــی دا بـــــــزربن
حـــەز دەکـــەن لاشـــەيان تـــەڕ بـــێ
نـــەوەك پێـــستێکی کـــزر بـــێ *

★ ★ ★

ژيــــان بـــێ مـــــردن ناخۆشــــــە
خۆشـــی تاســــەر ســـوك وبۆشـــە
مـــردن نـــەبێ ژيـــان بـــێ تامـــە
هـــــەر وەکـــــو نێــــرەو بدۆشــــە

★ ★ ★

---

* سر : پێ يان ناخۆشە .
* خزر : واتە حەزرەتی خدری زندە .

بـــــەڵام ئـــــەوی ســـــەیرە لـــــەلام
وێنەیـــــەك كردومـــــی سەرســـــام
مێـــــشكی لێ داگـــــیر كردومـــــە
ئـــــەو وێنـــــەی وا ڕون و زەڵام*

★ ★ ★

مـــــردن نـــــەما ، لـــــەو نیگـــــارە
منـــــاڵ نـــــەیكرد دارە دارە
بـــەڵام كێـــشیان گـــەلێ كـــەم بـــوو
ســـەیرم دەهـــات بـــەو ئاكـــارە

★ ★ ★

ڕۆژێ دادێ نامێنـــــێ مـــــردن*
لـــــەبالایا كـــــەمێ ووردن
خۆزگـــــە بەئێمـــــە دەخـــــوازن
ئـــەوان زانـــست وای لـــێ كـــردن

---

★ كزر: واتە ووشك
★ زەلام: واتە گەورە
★ نامێنێ مردن : مەبەست لەوەیە تەمەنی مرۆڤ زۆر درێژ دەبێ بۆ نزیكەی ١٠٠٠ساڵ

## (( ئەمریكا ))

وولاتێكـــــــی ڕۆژ ئـــــاوای دوور
خاكەكـەی هـەر گەنجـەو هـەم بـور *
لەســـەر دەمێـــك زۆر نـــاكۆك بـــوو
لەگـــەڵ بەیـــداخ و ئـــاڵای ســـوور

* * *

ئێـــستا گـــەورەی گـــشت دنیایـــە
وولات وەك ئـــەو نیتـــی پایـــە
ئـــەوەی بڵـــێ ملـــەی دەكـــەم
فـــشەیە ودەنگـــــی زوڕنایـــــە

* * *

ئـــەو قـــازانج دەكـــا بـــێ مایـــە
ئـــاڵتون لـــەلای وەكـــو كایـــە
ئێـــستا (ئـــەمریكا ) ت ناســـی
ســـوپا وچـــەكی لـــەبن نایـــە

* * *

---

* بور : واتە بەیار ، ئەو زەویە ی كە هەرگیز نە كێڵراوە .

ئـــــابوری گـــــەلێ  بــــــەهێزە
لـــــەو دنیایـــــە زۆر بــــــەرێزە
ئـــەوەی مـــل نـــەدا بـــۆ قـــسەی
چـــــاکی نیـــــشان دەدا نێــــــزە

★ ★ ★

خـــوێن خـــۆری ئێمـــەی لـــەناو بـــرد
پـــێ خۆشـــحاڵ بـــوین درشـــت وورد
وا تـــێ بگـــــەم بەچـــاو بینـــــیم
کـــە دکتـــاتۆر چـــۆن چـــۆنی مـــرد

★ ★ ★

ژێـــر دەســـــتەی زۆر کـــردن ڕزگـــار
دەوڵەمەنـــــدی کردنـــــە هــــــەزار
زۆربـــــەی دنیایـــــەی بەدەســــــتە
چـــــۆنی بـــــوێ وا دەیکـــــا کــــار

★ ★ ★

بەڵام تاسەر ئاوا نابێ
هاکا شێتە پیاو پەیدا بێ
بەچەکی ئەتۆم لێ ی دەدا
گەر خرابێ یاخود چابێ

★ ★ ★

لەنیۆرك و لە واشنتۆن
زۆر زۆر دەبن کەلاوە کۆن
خەڵکەو دەبینم ڕادەکا
تانەی کوژێ ئەتۆم وبۆن

★ ★ ★

دەڵێ ی یاری ماراسۆنە
لەنیۆرك ولەم واشنتۆنە
دەبینم خەڵکەو ڕا دەکا
کەیفی خۆتە ، تۆ پێت چۆنە

★ ★ ★

لـــێ یـــان دەدرێ بـــە ڤایرۆســـی
دانیـــشتوانی لـــۆس ئەنجلۆســـی
دانیـــــشتوانی زۆری دەمـــــرن
بەچـــەکی بەنـــدەی مامۆســـی

★ ★ ★

لـــێ یـــان دەدرێ بەنـــەوەوی
ئـــەو وولاتـــی ئـــاوا قـــەوی
وازتـــان نـــەهێنا لەئـــەتۆم
هـــەی لـــەبابی منـــو کـــەوی

★ ★ ★

بەنـــەوەوی لـــێ یـــان درا
ئـــەو وێنـــەم وا بینـــی بـــرا
دواتـــر شـــەوی بەســـەردا هـــات
دیـــار بـــو ڕونـــاکی بیـــست چـــرا

★ ★ ★

دیـــم لاشـــە کـــەوتن بـــێ ژمـــار
تـــازە لـــــەکار تـــــرازا کـــــار
ئـــەم وێنەیـــەم بـــەم جـــۆرە دی
موشـــەك ڕێزیـــان کـــرد وەك قـــەتار

★ ★ ★

ئاسمـــــان دوکـــــەڵ دا پیۆشـــــیبوو
(لیـــزا) ش مانگـــــای نەدۆشـــیبو
بـــــەرە بـــــەیان ئـــــەوە ڕویـــــدا
ســـــاوا شـــــیری نەنۆشـــــیبو

★ ★ ★

لـــــە بەیانیـــــەوە تـــــا ئێـــــوارە
زۆر زیـــان گـــەیی بـــەم ســـێ شـــارە
ئـــەو وێنـــەم وا دی ئـــەو جـــارە
ڕێنـــاس ئـــەو وێنـــەی لـــێ دیـــارە

هەولێر / ٢٠٠٨

## (( کۆریا ))

بـــالاّ ڕێــــك باریـــــك چـــاو بـــچوك
ســــپیکەڵە نـــــە ئێــــسك ســــووك
ئێمــــــە لــــــە زمانیــــان ناگـــــەین
ترینگـــە ترینگـــە و جوکـــە جـــوك ⋆

⋆ ⋆ ⋆

دو وولاّتــــــن ئەبــــــەم نــــــاوە
زەمانێکــــــــە لـــــــەت کـــــــراوە
ئێـــستا کـــە دوو وولاّتـــی جیـــان
منـــــالّی یـــــەك دایـــــە وبـــــاوە

⋆ ⋆ ⋆

شـــەرق و غـــەرب بەشـــیان کـــردن
هەریـــەکیان بـــۆ لایـــەك بـــردن
خـــــەڵکی ئاقـــــڵ وپێـــــشکەوتون
لــــــە پیـــــــشەسازی زۆر ووردن

⋆ ⋆ ⋆

---

⋆ ترینگە ترینگ : مەبەست لەدەنگی تەقە تەقی قاپ وقاچاغ

گـــشت دۆڵـــێ ســـەرەکەی کێـــوە
دوای هــــەر هــــەورازێ نــــشێوە
چـــۆن دەزانم ئـــاگر گەرمــــە و
ساردیــــــشن بــــەفرو کڕێــــوە

★ ★ ★

زۆربـــەی گیانـــدارێش گۆشـــت خـــۆرە
تــــەنیا بــــەدە گورگــــە بــــۆرە
چـــۆن دەزانم گـــەرد چــــەند زۆرە
گیانـــداریش چـــەند جـــۆر بـــەجۆرە

★ ★ ★

وادێ ســــــنوریان نـــــا مێنــــێ
کەســــێکیش ناویـــان ناهێنــــێ
بلــێ بـــۆ ؟ ئـــەی بـــرای ئـــازیز
چــــونکە دەریـــا تــــەوژم دێنــــێ

★ ★ ★

تـــــەوژم دێنـــــێ لــــە بۆكۆريــــا
دەبنـــــەوە يـــــەك ئـــــەو دوی جيـــا
هـــــەردوك نــــوقمی دەريــــا ئـــــەبن
شـــــار و گونـــــــد و دۆڵ و چــــيا

★ ★ ★

مـــــــەڵێ ڕێنـــــــاس بايەقوشــــــــە
گيـــاش لـــــەپێش چـــاوانی پووشـــــە
مـــــەڵێ هــــــەڵماتی هەڵـــــدەدا ★
كەچـی لـێ ی ديـار نـی يـە مووشـە ★

★ ★ ★

هــــــەموم وێكـــــــڕا لەبـــــەر چـــــاوە
چـــــی كۆنينــــــە و چــــی لــــــە دواوە
وەكـــــــــو ڕۆژی ڕون دەيبيـــــــــنم
ئـــــــەوەی هێـــــشتا ڕوی نـــــــەداوە

★ ★ ★

---

★ هەڵمات : واتە (كەلا) بەزاراوەوی هەولێری
★ موشە: ئەو نامانجەيە كەهەڵماتی بۆ هەڵدەدەن
لە هەولێری پێ دەڵێن(تاكە )

چۆن دەزانم شەکر شیرین

خوێنیش دێ لە دەمی برین

چۆن دەزانم شەو تاریکە و

ڕۆژ ڕوناکە و گەرمای بەتین

* * *

ئاواش بەجوانی لێم دیارە

عارەبو حوشتر ومەتارە

کەلە بیابان وێڵ دەبن

کۆریاش ئاوایە ئەو جارە

* * *

کۆریاکان دەبن غەرقی ئاو

تەوژمی دەریا دێ بەتاو

خەڵکێکی کەم دەرباز ئەبن

ئەوانیش ئەوانەن لەڕاو

هەولێر / ٢٠٠٥.

## (( تیبت ))

چەند دەیەیە ژێر دەستەنە
لەدوای (چین) دەکەن دەسکەنە
کەچی ئێستا دەلا یلاما
بێ وولات وبێ مەسکەنە

★ ★ ★

تیبت کەسەر بەخۆی نەما
کە شیوعی هاتن لەو دەما
کاهینان پەر تەوازە بوون
لەخەفەتان پشتیان چەما

★ ★ ★

کەوتنە ناو دەردو خەرمان
لەو کاتەوە هەر بەتەمان
نانێ بەئیسراحەت ناخۆن
یاجەمێ لە هەر سێ جەمان

★ ★ ★

تیبــــت ئـــاییِنی بــــوو سیـــــستەم
بەخۆشـــی بـــێ یـــا خــــود ســــتەم
کەچــــینیش چــــووە پــــاڵ ســـۆڤیەت
ئاسمــــانی تیبــــت گرتــــی تـــــەم

* * *

دەلا یلامــــــای گــــــەورەی دینــــــی
کەئـــــەو کارەســــــاتەی بینــــــی
زێـــد ومەســـکەنی بــــەجێ هێــــشت
لــێ ی حـــەرام بـــوو خـــاکی چـــینی

* * *

وولاتیــــان لەدەســــــت دا تیبتـــــی
چـــۆن میــــسر نــــەما بــــۆ قیبتـــی
لــــەو ڕۆژەوە (تیبتــــــی ) یــــانیش
دەچـــــێژن تــــاڵی یــــان تفتـــــی

* * *

---

* دەلا یلاما : گەورەی ڕۆحی لای تیبتیەکان

کەمرۆڤ وولاتی لەدەست چو
موسڵمان ، بوزایی ،یا جو
کیێش‌و سەنگیشی نامێنیێ
بەقەد گرانایی یەك مو

* * *

جیێ نزرگەی باب وباپیر
درایە بەر گوللەی شەست تیر
لە ئاسمان بەرز دەبۆوە
دەنگی گریان‌و زیرە زیڕ

* * *

لەو کاتەوە (دەیخولێننەوە*)
بەهیوای ڕۆژی بێنەوە
بێنەوە سەر عەرشی خۆیان
خەم لە خۆ بڕەوێننەوە

* * *

---

* دەیخولێننەوە : مەبەست لە نوێژو خوداپەرستی تیبتی یەکانە، کەشتێکیان پیێ یە وەکو دەهۆڵێکی بچوك وایە دەسکێکی پێودیە ئەوان هەمیشە بەدەستی ڕاستیان دەیخولێننەوە . واتە دەیسوڕێنن

شـــــوێنی پـــــیرۆزی باپیریـــــان

ئـــێ چـــۆن دەچـــێتن لـــــەبیریان

هاکــــــا بونــــــەوە ســــــەربەخۆ

لـــــەملیان کـــــردەوە (نــــیر) یـــــان

* * *

تیبتــــــی ئازانــــــە وبــــــوێرن

خۆیــــان لەیــــەك هــــەڵناوێرن

بەچـــاوی خـــۆم وورد وورد بینـــیم

کــــــەبانگی حــــــەق ڕادەدێــــــرن

* * *

تیبتــــیش دەبنــــەوە ســــەربەخۆ

بەچـــاو دەیبیـــنین مـــن و تـــۆ

دەلا یلامـــــای کـــــراس نـــــارنجی

دێتـــە ســـەرهەمان عەرشـــی خـــۆ

هەولێر / ٢٠٠٤

## (( کوردستان وبەفر ))

زۆر جوانـــە قـــسەی پـــیرو پێـــشینان
ووتیـــان هـــەور چـــوو بـــەرەو بادینـــان
منـــاڵ بـــووم کاتـــیٚ ئـــەوە دەوتـــرا
خـــۆ هەڵـــدەن لـــەبۆ کونـــە کادینـــان*

★ ★ ★

کەلـــەو هەورانـــە وورد دەبومـــەوە
بەچـــاوی تیـــژو پـــڕ لەزوومـــەوە
ســـەرم دەرنەچـــوو براکـــەم لـــەخۆو
لەمێـــشکی ئـــاوا چـــەق بەســـتومەوە

★ ★ ★

هەمیـــشە لـــەبیرو فکـــران دابـــووم
لەبیرکردنـــەوە بـــۆ خـــۆم ڕۆ دەچـــوم
نیگـــام هەمیـــشە لـــەلای هـــەوران بـــوو
بـــەو زســـتانی واساردوســـڕو شـــوم

★ ★ ★

* کادین : ئەو ژورەیە کەلە دیٚ یەکان (کا) یان تیا هەڵدەگرت ، مەبەست لێرەدا ئەوەیە ڕیٚ ی دوور مەگرنە بەر

دەمگوت ئەی هاوار ، بۆ وایە خودایە
ئەو هەورە جوانە لەبەرزی دایە
ئەو گرمە گرمە چی پەیدای ئەکا
ئەو دەنگەی لەدوای بروسکەدایە*

* * *

چی بکەم ئەو کاتە ئاوا مناڵ بووم
ئەوەم لەبیرە تەنها پێنج ساڵ بووم
ئنجا نازانم ڕۆح سوك بووم یاخود
هەروەکو ئێستا شێت وخوێن تاڵ بووم

* * *

ئەو کاتەش وابوم بیرم کردەوە
چاو ماندو دەبو خەو دەیبردەوە
دەرگای مێشکیشم قفڵی لێ درابوو
تا نەمکردەوە کەس نەیکردەوە

* * *

دەمگوت چی یە ئەو بروسکە
لەکوێ ڕادێ ئەو تروسکە
ئەو بارانە خورە چی یە
کەدێتە خوار بەپلوسکە

★ ★ ★

ئەو کات زستانی سەرمابوو
جلێکی زۆر لەبەرما بوو
شەختەو سەهۆڵی زستانیش
ئەلەم بەرەو لەو بەرمابوو

★ ★ ★

لەهەرلا یێ پارچە شەختە
بەستبوی گۆم ئەلەو وەختە
بەهارانیش بەری دەدا
بەفر لوتکە ، نەختە نەختە

★ ★ ★

---

★ خۆی دەنگ و بروسکە بەیەکەوە یە ، بەڵام ئەو کاتە منداڵ بووم وام هەست دەکرد پێشان بروسکە دێ

کـــــەمن ئـــــەو شـــــیعرە دەبێـــــژم
فرمێسکیـــــــــشم هەڵدەڕێـــــــــژم
منـــــاڵی وهـــــەرزەکاریم چـــــوو
پـــــــــیرە لاوی وڕو گێـــــــــژم

★ ★ ★

جـــاران زســـتان زۆر بـــاران بـــوو
کەخۆشـــی چـــەکمە خـــواران بـــوو
گـــــەنمو جۆیـــان بـــڕی دەکـــرد
هـــــەروا ڕۆژی جوتیـــاران بـــــوو

★ ★ ★

کەئـــــەوە دە دوانـــــزە ســـاڵە
زۆر بـــێ هیـــوا بوونـــە پاڵـــە
بـــەڵام مـــن دیـــم تاســـەر نـــی یـــە
زۆریـــش چـــاك ببـــو ئـــەم حاڵـــە

★ ★ ★

بینیم بەفرێکی زۆرباری
لەچیاو لەگوندو شاری
هەمو شتی بەبنە خۆدا
جێ نەبو بنیشێ پاساری

* * *

زۆربەی زۆر شوێنی کوردستان
دەکەوتە ژێر بەفری زستان
نەمتوانی بەفر بپێوم
نە بەقولانج نە بە بستان

* * *

بەفرم دی گەیشتە گوێ بان
ئێوەش دەبینن بەچاوی خۆتان
بەفرو شەختەو زریان دەبینن
دیاری ئاسمانە هاتوە بۆتان

* * *

ئەوەم بەچاوی خۆم دی
کەدارو بەردی بەستی
گەر بپرسی چ کات دێ
لە چل وەرە وە بۆ سی

* * *

چل ساڵی تەواو نابە
ئنجا لەخۆت وریابە
ئەو بەفرە داتنەپۆشێ
لەناو ماڵی خۆت دابە

* * *

تا درەنگ ناتاوێتەوە
باوی قاپوت دێتەوە
پاڵەش دڵیان خۆش دەبێ
ڕوبار دەگەشێتەوە

هەولێر / ٢٠٠٩

## (( گرگان ))

لـــه نزیکـــی زینـــی وەرتـــێ*
چـــیا دەبێتـــه چـــەند کـــەرتێ
ئـــەوی بیـــنم گـــشت دێتـــه جـــێ
لەبـــەر دەمـــی نـــی یـــه شـــەرتێ

★ ★ ★

نزیـــــك پڵنگـــــان و بۆتـــــێ*
دارو بـــــەرد وێکـــــڕا دەســـــوتێ
دو ئـــــاگران بـــــەدی ئەکـــــەم
بـــــەڵێ ئـــــاگر ، یـــــەك ناجۆتـــــێ

★ ★ ★

ئـــەو ئاگرانـــەی دیـــم بەچـــاو
لـــــەزەوی دەر هـــــاتن بـــــەتاو
بەپەلـــــه خـــــەڵك هەڵـــــدەهات
نـــسیبیان نـــەبو کفـــن وجـــاو

★ ★ ★

★ وەرتـــێ : شـــارەدێ یـــه لـــەنزیك چـــیای کـــارۆخ - کوردستانی عێراق
★ پڵنگان وبۆتێ : دووگوندی نزیك (وەرتێ ) ن .

بینـــــیم دوكـــــەڵی ڕەش وبـــــۆر
گرتبـــوی بـــەری تیـــشكی خـــۆر
ئـــاگر و گـــڵ بـــوو دەبـــاری
گڵـــی بـــۆر وئـــاگری ســـۆر

★ ★ ★

خـــەڵكم بینـــی چـــونە ڕانیـــە
مـــەڵێ ئـــەو قـــسە وانیـــە
ڕێنـــاس ئـــەركی بـــەجێ گەیانـــد
ئـــەو ئەركـــەی لەســـەر شـــانی یـــە

★ ★ ★

لـــەو وێنەیـــە بـــێ گومـــانم
گەیانـــدم ئـــەركی سەرشـــانم
ئـــەوەی بینـــیم پێتـــان دەڵـــێم
بـــەپێنوس یـــا بـــە زمـــانم

★ ★ ★

لـــــەنزیك وەرتــــێ وپڵنگـــــان
گـــڕێ بـــەرزە بـــێ بـــۆ ئاسمـــان
بەدوکـــــەڵی ئـــــەم ئـــــاگرە
خـــەڵك دەردیـــان دەبـــێ گـــران

★ ★ ★

لـــەنزیك مەســـکەنی ئیـــبراهیم
دڵنیـــام بەچـــاوی خـــۆم دیـــم
دوکـــــەڵ ئاسمـــــانی گرتــــەوە
لـــەبیر ڕا چـــوبوم ، ڕاچـــەنیم

★ ★ ★

ئـــەم وێنەیـــەم ئـــاوا بینـــی
گرکـــــان وئـــــاگری بــــەتینی
چـــــیاو دۆڵ ودارو بــــــەردی
دەتوانــــەوە چـــین بەچـــینی

★ ★ ★

دەســــــوتا لاپـــــاڵی شـــــاخی
گــــــڕی دەگــــــرت ڕەزوبـــــاخی
هــــیچ شــــتێ خـــۆی لەبەرنــــەگرت
هیچیـــــشی لـــێ نـــــەبوو یــــاخی

★ ★ ★

چـــی بکـــەم وێنـــەم دێتـــە بەرچـــاو
بـــەرد وەکـــو خـــۆی ، وەکـــو خـــۆی ئـــاو
ئەوانــــــەی ئــــــەمن دەیبیـــــــنم
ڕاســــتین نــــەوەك بیرێکـــــی خـــــاو

★ ★ ★

بـــاش گـــوێ بگـــرە هـــۆ کـــوڕی خـــاس
بـــــا ئەوەشـــــتان بــــۆ بکـــــەم بـــــاس
لــــــەدوای ئــــــەو دوو بورکانــــــەدا
دەردەکــــــــــەون دوڕو ئــــــــــەڵماس

★ ★ ★

لەدوای گڕکان ، شەڕی ئەڵماس
پارە هات وگڕکان خەلاس
ئەوەی گڕکان نەیکو شتبوو
شەڕی ئەڵماس کردی کەساس

★ ★ ★

ئێستاش باوەڕ ناکەی کاکە
ناگاتە شەست تەماشاکە
ئەو قسەم وەك خۆی دێتەجێ
بیری لێ بکەوە چاکە

هەولێر / ٢٠٠٩

## (( ئێران ))

هەستێك لەگوێم دەنگی داوە

هەستیش وێنەیە تەواوە

دیم شەڕو ماڵ وێرانی بوو

ئێرانم دی بەم دوو چاوە

★ ★ ★

ئەی برا هەڵایە وڕاوە

کەروێشکێکە و واهەڵساوە

ئازا قەڵەمبازان دەدا

جووتە تانجیش والە دواوە

★ ★ ★

ئێران وولاتی مادو پارس

لە مێژە لەو خاکەن وارس

ئەسکەندەری گەورە نەبێ

کەسی تر نەیکردون جارس

★ ★ ★

خـــــاکی خێــــــرو بەرەکەتـــــــە
میــــا ندواوبـــــەخۆی جەنەتـــــە*
ئێــستا یــەك پارچــە وبــێ خەوشــن
مــن دیــم لاشــەی کــە چــەند لەتــە

* * *

پارچــــــە پارچــــــە ببــــــو ئێــــــران
هــــــەڵوەدابون یــــــەك خێــــــزان
ئــــــەو ئێرانــــــە ئــــــاوا جوانــــــە
پارچــــــە ببــــــون وســــــەرگەردان

* * *

فــــارس لایـــــێ ، لایـــــێ عەجــــــەم
ســــــەیرکە ، نیــــــــشانت دەدەم
کــورد لــەلایێ و ، هــی تــریش هــەن
کــوا خورشــید خــۆیی وجــامی جــەم

* * *

---

* میاندواو : شارێکی کوردستانی ئێرانە

پارچـــه پارچـــه كـــرا ئێـــران

بـــۆ هـــەر پارچـــە حـــازربوو ســـان*

هەريـــەك لايـــەكى لـــێ دەخـــوڕى

ئێرانـــى ببـــون ســـەر گـــەردان

* * *

ئـــەو ئێرانـــەی ئـــاوا خـــۆش بـــوو

كـــەجێ دالّـــدەی مـــن وتـــۆش بـــوو

بينـــيم پارچـــە پارچـــە ببـــوو

چـــرای گەشـــى وا خـــامۆش بـــوو

* * *

وا خـــامۆش بـــوو چـــرای گەشـــى

لێـــت نايـــە ئێـــران ، بـــەش بەشـــى

ســـەركردە گوناحيـــان هـــەبوو

نـــەزان وا دەڕێـــسێ تەشـــى

* * *

---

* سان : مير

چـــرای بـــەختیان خـــامۆش کـــرا
پێکـــی خـــەمیان پـــێ نـــۆش کـــرا
ئێرانـــی جـــوان ، لەبـــەر یـــەك چـــوو
مەنجـــەڵ بـــەبێ ســـەر پـــۆش کـــرا

★ ★ ★

ئێـــــران مایـــــەوە بـــــێ شـــــوان
بۆیـــە لـــەتیان کـــردن ، جـــوان
بونـــە پێـــنج شـــەش پارچـــە بـــرا
نـــەوەك ، هـــەر پارچـــەیەك وددوان

★ ★ ★

لـــــــەوەی ووتم دڵنیابـــــــە
چـــۆن ســـەنگ بـــەردە ، دەرگـــا بابـــە
پـــێم مـــەڵێ بێـــزارم مەکـــەو
ســـەرم ئێـــشا ئـــەوەی لابـــە

هەریر / ٢٠٠٦

## (( کوردستانی ئێران ))

کـــــوردی ڕۆژ هـــــەڵاتی ووڵات
لـــەژێر دەســـتی دەیبـــێ نـــەجات
ئـــەوە لـــەو کاتـــەی دادەبـــێ
کـــاکی جوتیـــار درەو ئـــەکات

★ ★ ★

درەو ئەکـــەن پاڵـــە وجـــوتێر
دەغـــڵ ودانیـــان نەیـــداوە خێـــر
واتـــە ، هاتەکـــەی چـــاك نـــەبووە
ســـکی جوتیـــاران ناکـــا تێـــر

★ ★ ★

ســـــەربەخۆ دەبـــــن ئەوکاتـــــە
بـــــەوەی نیـــــە ئێـــــستا ماتـــــە
ئێـــران ئـــاژاوەی لـــــە نـــاوە
چـــی لـــێ هـــات ، ئـــەو ڕۆژ هەڵاتـــە

★ ★ ★

ڕۆژ هەڵاتیش دەبن ئازاد
کوردیش بون دڵخۆش ودڵشاد
هاتنەوە سەر دەسەڵاتیان
نەوەو ڕۆڵەی دەوڵەتی ماد

★ ★ ★

پێتەخت چۆوە هەمەدان
هاتنە سەر شەقام بەسەدان
کچ وکوڕی ئەو وولاتە
لە شایی ولە هەلهەلەدان

★ ★ ★

درێژە ناکێشی ئەو خۆشی
کەشار ڕەنگی ڕەش دەپۆشی
کوردن وخەریکی شەڕن
کوردە ، نێرە دەی نایدۆشی ؟

★ ★ ★

کــورد لەیــەکتر ئــەگرن ســەنگەر
هــــەر لاشــــەیە لەدەشـــت ودەر
بــۆ بەربونـــە گیـــانی یـــەکتر ؟
والێـــك دەســون کۆتـــە خەنجـــەر

★ ★ ★

دوای ئـــازادی یـــەکتر ئـــەکوژن
لـــەوێ زۆر ئـــەبن بێـــوەژن
شـــایی یـــان لـــێ دەبـــێ بەشـــین
گریانـــــە لـــە ڕۆژی جـــەژن

★ ★ ★

ڕۆژی جـــەژن یـــەکتریان کوشـــت
گرپـــە وزیـــــڕە ووردو درشـــت
تـــابێزاربون هەرکوشـــتار بـــوو
لەیـــەکتریان بـــڕی بڕشـــت

★ ★ ★

براكـــــوژی بــــــەردەوام بـــــوو

دووســـالْ كـــاری خـــاس وعـــام بـــوو

دوایـــــی هاتـــــە ناویـــــان ئاشـــــتی

چـــابون ئـــەوەی ، جـــاران زام بـــوو

★ ★ ★

زامـــــەكانیش كـــــران هـــــەتوان

مەچـــۆ بـــرا لـــــەدو چـــــووان

ئـــــیتر بەیەكـــــەوە بـــــژین

لەگـــەلْ یـــەك مەپـــسێنن مـــوان

★ ★ ★

ڕێنـــاس بـــۆت نـــامێنێ تاســـەر

ئاگاداربـــــە ئـــەی بـــێ خەبـــەر

ئـــــەوەی ووتم گـــــشت ڕودەدەن

داهـــاتووی خـــۆت بكـــە ئەزبـــەر

هەولێر / ٢٠٠٧

# کۆتایی

گەر هەتبوو ڕایێ یان پێشنیارێ ، بیری لێ بکەوە بە ووردی جارێ ، بزانە چارە سەر لای خۆت ناکرێ ، گەر نەکرا ڕێناس خزمەتکارە گوێت بۆ ڕاگرێ ، زەنگ بکە گوێ دەگرم من لەسەرنج وڕات ، مەمێنە بێ وەلام نەخەوی کش ومات .

{ ٠٧٧١٠١٠٧٥٢٠ } هەشتی بەیانی کە ئەکرێتەوە ، تاکو

{٠٧٥٠٤٩٤٠٧٧١ } دوانزەی شەو ناکوژێنەوە .

زۆر سوپاسی هەموو ئەو بەڕێزانە دەکەم کە بــۆ لــە چــا پدانی ئەم پەرتوکە ، هاریکاری یان کردوم .

منتدى إقرأ الثقافي
للكتب ( كوردى - عربي - فارسي )
www.iqra.ahlamontada.com



## ((ڕامێنە))

هەر بیرکەوەو ڕابمێنە
واز لەماریفەت مەهێنە
خۆیەک نیە عیرفان و تور
یەک نیە گیانە ، سپی و سوور
دەمەوێ بزانم ئەمن چیم؟
چیم بۆچیمە ؟ بۆ میمە میم؟
گەرەک بزانم من بۆ هەم؟
بۆ وەلی نەگەیی بە شەم؟
بۆ ئەو دنیایە ئاوایە؟
بۆ بوک ژێردەستی زاوایە؟
بۆ ئاو شلە؟ بەردیش ڕەقە؟
بۆچی واتاڵە ئەو هەقە؟

چاپخانەی رۆژهەلات/هەولێر